ناوی کتێب: گرێکوێرە
ناوی  نوسەر : جمعە کانی لەلەیی
نەخشەی بەرگ : شیاو سەرتیپ تاهیر
نەخشەی ناوەوە : توانا ئەحمەد
ساڵی چاپ : ٢٠٢٣
نۆرەی  چاپ : چاپی  یەکەم
چاپخانە : چوارچرا
تیراژ :  ١٠٠٠ دانە
ژمارەی  سپاردن : ١١٥٩
نرخ :  ٥٠٠٠  دینار

# (١)

ئەمڕۆ یەکەمین ڕۆژی ساڵی دووەممە لە بەندیخانە و بەچاوی ئومێدەوە دەڕوانمە داهاتووم، گەرچی من بۆ هەتا هەتایە مەحکومم بەزیندان، بەڵام چرای هیوام نەکوژاوەتەوە و تیشکی چاوم خستۆتە سەر ئەو ڕۆژەی دەرگاوانی بەندیخانە بانگ دەکات: کێ سەودا عەزیز جەبارە با کەلوپەل و یاتاغەکەی کۆوە بکات ئازاد بووە.

دەزانن بەندیخانەش پیاوی خۆی دەوێت، مەبەستمە بڵێم مرۆڤی ترسنۆك لە بەندیخانە جێی نابێتەوە، یان دەبێ خۆی بکوژێت و توانای ئەو شێوە ژیانەی نەمێنێت، یان سیس و نەخۆش بکەوێت، دواجار لەسوچێکی بەندیخانە بە غەریبی و بێ نازی کەسوکار بمرێت، ڕەنگە منیش لەهەوەڵین ڕۆژی بەندکردنمەوە هێندە خۆڕاگر نەبووبم، بەڵام ئێستا پاش تێفکرین و لێکدانەوەی زۆر بۆم دەرکەوتبێت، باشتر ئەوەیە خۆڕابگرم لەبەردەم ئازار و مەینەتیەکانی بەندیخانە نەك ببەزم و خۆم تەسلیمی چارەنوس و قەدەرێکی نادیار بکەم.

ئەم ئازایەتی و خۆڕاگریەش ئەو کاتە وەچەنگم هێنا کە گەیشتمە ئەو باوەڕەی، خۆ بە بەلاش نەبوو بە هەتا هەتایی حوکم درام، بەڵکو من تاوانگەلی گەورە گەورەم ئەنجام دابوو، وا باشتر بوو سزای خۆمم لە چنگ بنێن. ڕاستیەکەی دەبوو من لەسێدارە درابام، چوونکە دەستم هەبوو لە کوشتنی چەندین

کەسی بێتاوان و ژیانم لە زۆر کەسی تری بێدەسەڵات و کڵۆڵ کردە دۆزەخ، نەك سزا بدرێم بە بەندکردنی هەتا هەتایی.

چەند خۆشە مرۆڤ دان بەهەڵەی خۆی دا بنێت و بەرپرسیارێتی ئەو تاوان و کردارە چەپەڵانە لەئەستۆ بگرێ کە کردوونی، هەرچەندە دەبوو زوتر ئەم هەست و تێگەیشتنەم بۆ دروستبا، لەگەڵ ئەوەش دا هێشتا باشە کە پاش حوکمدانم دانی پیا دەنێم، لەوەش خۆشتر بۆ کەسێکی وەك من ئەوەیە وانە لە هەڵە و کەموکووڕیەکانم وەرگرم و ئەو ڕێگایە بەربدەم کە دەزانم نامگەیەنێت بەئامانجەکانم و ئەو تێگەیشتنانەش وەلا بنێم کە ئێستا لێی تێدەگەم هەڵەن.

ئاخر هەندێك لەهاوڕێکانم هێشتا دان نانێن بە تاوانەکانیان و لەسوچێکەوە لەگەڵ خۆیان دا دەدوێن و لە شێوەی دڵدانەوە بە خۆیان دەڵێن خۆ ئێمە تاوانبار نین ئەوەی ئەنجاممان دابوو شەرع و یاسای خودایی لەپشت بووە.

دوو ساڵی ڕەبەقە لێرە لەم بەندیخانەیە لەگەڵ حەوت کەسی تردا لەژوورێکی هەشت بە چوار بەندم، هاوڕێی هەر ئەو کەسانەم کە لە کردەوەکان دا لەگەڵیان بەشدار بووم و هاوکاریان بووم، هێندە لەم ژوورە گەڕاوم و دانیشتوم و خەوتوم دەزانم بەرزی و درێژی و پانیەکەی چەندە، ڕەنگە بشزانم چەند خشت و چەند چیمەنتۆی تیا بەکار هێنراوە.

بینای بەندیخانەکە لەسەر شێوازێکی نوێ دروست کراوە و شێوازی مامەڵە و هەڵسوکەوتیش لەگەڵ بەندییەکان جیاوازە لە بەندیخانەکانی تری هەرێم، بۆ نموونە لێرە

گۆڕەپانی تۆپێنی تیایە بەهەموو جۆرەکانیەوە، هۆڵێکی وەرزشی گەورەی تیا دروستکراوە، تا بەندیەکان کەڵکی لێوەرگرن، هەروەها قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری و بنەڕەتی و ئامادەییشی تیاکراوەتەوە، ئەوەی بەلامەوە گرنگ بوو بۆ بەندیە نەخوێندەوارەکان کراوەتە مەرج کە دەبێ قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری تەواو بکەن. بڕیارێکی باشی بەندیخانەکە ئەوەیە هەر بەندییەك هەرسێ قۆناغەکە بەسەرکەوتویی ببڕێ دوو ساڵ لە حوکمەکەی کەم دەکەنەوە ئەگەر ماوەی بەند کردنەکەی لەشەش ساڵ کەمتر نەبێت، خۆ ئەگەر لە نێوان سێ تا شەش ساڵ بەند بێت ئەوا ساڵێك لەحوکمەکەی کەم دەکەنەوە. هەروەها چەندین مامۆستای تایبەت تەرخان کراون بۆ هەر بەندیەك کە ئارەزوو بکات فێرە پیشەی دارتاشی یان سەرتاشی یان ئاسنگەریی یان درومان بێت بۆ ئەوەی دوای ئازاد بوون و گەڕانەوەی بۆ نێو کۆمەڵگە دەست سپی و بێکار و دەستبەتاڵ نەبن، بەهۆی ئەو پیشەیەی فێرکراوە بتوانێ بژێوی خۆی بەدەستبهێنێت.

ڕەنگە سەیرتان پێ بێت پیاوکوژ و تیرۆرستێك ئاوا بە جوانی و بێ گرێوگۆڵ قسەتان بۆ بکات و چیرۆکی ژیانی خۆیتان بۆ بگێڕێتەوە و زمانی قسەکردنی هێندە خاوێن و پاراو بێت و وەك کەسێکی ڕۆشنبیر بدوێ و وەك پەپوولەیەك دەربکەوێ، ئێ من دوو ساڵی ڕێکە حوکم دراوم و شەش مانگیش لە ژووری تاکە کەسی لێکۆڵینەوەی وردم لەگەڵ کراوە و ئازاری جەستەیی و دەروونی زۆرم چەشتوە، لەم ماوە درێژە ڕوانیمە ئەزمونی ژیانی سەدان بەندکراوی تر کە بۆچی گیراون و حوکم دراون و چۆن ژیاون، ئیدی دەبوو وەك مەدرەسە کەڵك لە بەندیخانە

و هەڵە و خراپەکاری و هەڵسوکەوتی نابەجێی بەندیەکانی ناوی وەرگرم و تیایدا ڕۆشنبیریەکی گشتی بەدەستبهێنم و لە نهێنیەکانی سەرکەوتنی ژیان تێبگەم. وێڕای ئەمەش سوود لەو کتێبخانە گەورەیە وەرگرم کە لە ناو بەندیخانە بۆ بەندیەکان کرابوەوە، لەم کتێبخانەیە دا هەزاران کتێبی ئایینی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و فەلسەفی و مێژوویی هەبوون گەر من و هاوڕێکانم بمانویستبا زۆرترین کتێبمان دەخوێندەوە و سودمان لێوەردەگرت، سەیرتان پێنەیەت کە هەفتەی کتێبێك بگرە زیاتریشم خوێندۆتەوە و لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا زیاتر لە ۱۰۰ کتێبی جۆراوجۆرم خوێندەوە و سوودی زۆریشم لێیان وەرگرت.

ڕاستیەکەی بەندیخانە بۆ من وەك زانکۆ وابوو، تا فێر بم چۆن بژیم و چۆنیش هەڵسوکەوت لەگەڵ دەوروبەرم بکەم و بە چ شێوازێك ڕەفتار بکەم و کامە ڕێگا ڕاستە بۆ بەڕێکردنی ژیان بیگرمە بەر. لە بەندیخانەش باشتر ئەو مامۆستایە بوو کە بۆ ماوەی سێ دانی ئێواران لە ڕێگەی کاکە یاسینی برامەوە توانی بگاتە بەندیخانە و چاوپێکەوتنم لەگەڵ ساز بکات و چیرۆکەکانی من و خۆکوشتنی بەندیەکی هاوڕێم یاداشت بکات، ئەو مامۆستایە ناوی هیوایە کاتێ لەفەرەنسا دەیەوێ بگەڕێتەوە کوردستان لە تەلەفزیۆنەوە گوێبیستی هەواڵی خۆکوشتنی بەندیەك دەبێت خەم دایدەگرێ و دەیەوێ دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان بە ڕاز و نهێنی ژیانی ئەو بەندیەی لە بەندیخانەی هەولێر خۆی کوشت بگات و هۆکاری خۆکوشتنەکەی بۆ دەربکەوێ، مامۆستا هیوا لەخۆی دەپرسێت : بۆچی مرۆ پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات؟ دیسانەوە بەخۆی دەڵێت:

ڕێگاچارە کامەیە بۆ ئەوەی پێش لە خۆکوشتنی خەڵك بگرین؟

مامۆستا هیوا لەساتە وەختی یەکەمی بینینی من بەر لەوەی هیچ پرسیارێکم لێبکات گوتی : دەمەوێت بزانیت چۆن و بە چ ڕێگەیەك گەیشتمە لای تۆ تاکو گوێ لە چیرۆکەکانی ژیانت بگرم و بزانم بۆچی گیراوی و لەسەر چ تاوانێك بە هەتا هەتایی حوکم دراوی، هەروەها دەمەوێت ئەوەش بزانم بۆچی بەندیەکە خۆی کوشت، بەر لەوەی تۆ چیرۆکی خۆتم بۆ بگێڕیتەوە من چیرۆکی گەیشتنی خۆمت بۆ باس دەکەم.

لە پەنجەرەی ژورەکەی خۆمەوە دەمڕوانیە دیمەنی کلۆ بەفرەکان کە لەشێوەی پوخە پەمۆ لە قووڵایی ئاسمانەوە دادەبارینە سەر زەوی، کلۆ بەفرەکان سپیتر لەڕەنگی ئاسایی دەهاتنە بەرچاوان، دوان ......... سیان ......... چوار.......... بگرە زیاتریش لەیەك دەئاڵان، دەتگوت سەما بۆ یەکتر دەکەن.

ئاسمان تا چاو بڕی دەکرد هەر کلۆ بەفر بوو، بە خێراییەکی زۆر بەرەو خوار ڕێزیان بەستبوو، کە لەزەوی نزیك دەبونەوە پێشبڕکێیان نەدەما و هێواش دەبوونەوە لە ڕۆیشتن و لوولیان دەخوارد و دەکەوتنە سەر گەڵای درەخت و لق و پۆپی گوڵەکان و چیمەنەکە، کلۆ بەفرەکان لە دڵداری یەکتر دەچوون یەکتریان جێنەدەهێشت و پێکەوە بەسەما کردن دەهاتن، دەهاتن بۆ ئەوەی زەوی بکەن بە بووك بۆ ئاسمانی بێ بن.

بێدەربەستانە سەرنجم چووبوە سەر کلۆ بەفرەکان، کە لەسەر لق و گەڵای درەختەکانی ناو حەوشەکەم کەڵەکە ببون و لقەکانی شۆڕ کردبووەوە بۆ سەر زەوی، شنەباکە لەرەی بە

گەڵاکان دەکرد و بەفرە کەڵەکەبووەکەی لە شێوەی تۆزی سپی بەردەدایەوە سەر چیمەنەکە و پەرش و بڵاویدەکردەوە و بە خێرایی لە چاونوقانێك دا دەتوانەوە و دەبوون بەئاو، بەهۆی توانەوەی بەفرەکەوە، باخچەکە شڵپەی دەهات و لەمێرگ دەچوو .

چاوەکانم کز ببوون و هەست و ئاگاییم کەم ببوەوە وەك بڵێی خەریکبێت خەوم لێبکەوێ، جار جار تەماشای تەلەفزیۆنەکەم دەکرد و جارجایش خەیاڵم دەچووەوە لای کلۆ بەفرەکان و گەڵاو لقی درەختەکانی ناو حەوشەکە و گوڵە ژاکاوەکانی باخچەکەم کە سەرماو باو بۆران و شەختەو زوقم ڕوخساری کاڵ کردبوونەوە و هەندێکی لێوەراندبوون.

ئەگەر بەفر هەموو ڕێگاکانیشی بگرتایە، ئەگەر بەفر تەواوی شار و فڕۆکەخانەکانیشی دابپۆشیایە، لە سەفەرەکەم پەشیمان نەدەبوومەوە، مەگەر هەر فڕۆکە هەڵنەفڕیبا هێندە تامەزرۆی گەڕانەوە بووم، هەردوو جانتاکەم لە نزیك دەرگای ژووری دانیشتن لەسەر یەك دانابوون کە پڕ بوون لە جلوبەرگ و کەرەستەی سەفەرەکەم، هاکا لەکۆمپانیاوە تەلەفۆنم بۆ بکرێت و وادەی چوونم بۆ فڕۆکەخانە بۆ دیاری بکەن.

ورشەورشی با کە دەرگا و پەنجەرەکانی دەلەراندەوە و کەلوپەلی ناو حەوشەی پێکدا دەدا و تەقەتەقی دروست کردبوو، بێداری دەکردمەوە لە چاونوقان و خەوی کەروێشکی، تاوێك خەو دەچووە چاوەکانم، تاوێك بێدار دەبوومەوە، دڵم لای کوردستان بوو، لەبەر خۆمەوە لەگەڵ کوردستان دەدوام: هاکا بگەمەوە ئامێزت، ئینجا لەگەڵ هەولێر دەدوام، خۆدواندنەکانم

لە ورێنە دەچوون، بە هەولێرم دەگوت: بیری یەك یەك شەقام و کۆڵانەکانی باداوان و تەیراوە و تەعجیل و سەیداوە و گوڵە ژاکاوەکانی گڵکەند دەکەم، بیری پاکەت فرۆش و پاقلە فرۆشەکانی بەردەم قەڵا و مەزاتخانەکە دەکەم، حەزم لێیە سەر بکێشم بەکتێبخانەکانی ژێر قەڵادا و تەپوتۆزی نیشتووی سەر کتێب و ڕەفەکان بسڕمەوە و ناونیشانەکانیان بخوێنمەوە، حەزم لێیە بە قادرمەکاندا بەرەو سەر قەڵات سەرکەوم، لەوێوە بڕوانمە منارەی چۆلی و پێدەشتەکانی هەولێر، لەسەر قەڵاوە هەموو کوردستان ببینم، ئیدی بە بەهەشتی کوردستان شاد ببمەوە.

لەناکاو چاوم کەوتە سەر ئەو هەواڵە بەپەلەیەی لەشاشەی تەلەفزیۆنەکەوە دەرکەوت : ئەمشەو زیندانیەك لەگرتوخانەی هەولێر خۆی کوشت .

بەم هەواڵە هەموو خۆ دواندن و خەیاڵەکانم بیرچوەوە، لەبیرم نەما کە گەیشتمەوە کوردستان دوای پشودانێکی چەند ڕۆژە لەکوێوە دەستبکەم بە سەردان و بەسەرکردنەوەکانم.

بۆچی ئەم زیندانیە خۆی کوشت؟

خۆ هەندێك زیندانی فەرمانی لەسێدارەدانیشی بۆ دەردەچێت، بەڵام خۆی ناکوژێت، چوونکە هیوای بەوەیە لە دواچرکەی ساتەوەختی لە قەنارەدانی لێبوردنی گشتی دەربچێت، یان دەرگای زیندان بشکێنرێت، یان گۆڕانکارییەکی سیاسی ڕووبدات و لە مردن ڕزگاری بکات چجای زیندانییەکی مەحکوم.

جارێکیان لە بەندیخانەیەك پازدە لەو زیندانیانەی فەرمانی

لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوبوو، خرانە ژێر تاقیکردنەوە، تاقیکردنەوەکە ئەوە بوو هەر بەندییەك بخرێتە ژووری تاکەکەسی بێئەوەی بهێڵن کەسیان پەی بەم تاقیکردنەوەیە ببەن، دواتر پاسەوانێك بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێك بەدەمانچەکەیەوە بنێرنە ژووری هەر یەکێك لە زیندانیەکان و لەکاتی هاتنە دەرەوەی، دەمانچەکەی لێبکەوێت بەجۆرێك زیندانیەکە لەوە تێنەگات کە کەوتنی دەمانچەکە دەستئەنقەستە و بۆ تاقیکردنەوەیە، دەمانچەکە ئەو جۆرە فیشەکانەی تیابێت کە تەنها باروتن، کاتێك پاسەوانەکە دوای هاتنە دەرەوەی دەرگاکە کلۆم دەدات دەبینن هیچ کام لەزیندانیەکان دەمانچەکە بۆ خۆکوشتن بەکارناهێنن تەنها یەکیان نەبێت، ئەمەم بە خەیاڵدا هات ویستم لەگەڵ خۆم دا بدوێم، تا هۆکارەکانی نائومێدی مرۆ بدۆزمەوە لەو چرکە ساتەی خۆی پەلکێشی مردن دەکات.

هێندەی پێنەچوو کەناڵەکە هەواڵی تری بەپەلەی بڵاو کردەوە : خۆکوژەکە یەك لەو گروپە ئیسلامیە توندڕەوانە بووە کە ماوەیەك لەمەوبەر لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشەوە دەستگیر کرابوون.

کڵۆ بەفرەکان بەردەوام بوون لە داباریەن، لقی درەختەکانیش سەریان سپی ببوون لە بەفر و لقەکانیش سەریان چەماندبوەوە بۆ سەر زەوی و گەڵاکانیش سڕ ببوون، منیش لە چاوەڕوانیدا سڕ بووم، هاکا تەلەفۆنم بۆ بکرێ تا بەرێبکەوم بۆ فڕۆکەخانە.

هەواڵی خۆکوشتنی ئەو بەنکراوەش بیرکردنەوەی ئاڵۆز کردبووم، بە خۆمم گوت:

-کەواتە لە سەردانەکەم بەندییە خۆکوژەکە دەکەم بە کەرەستەی نوسینێکی نوێ و لە هۆکاری خۆکوشتنەکەی دەکۆڵمەوە.

دەمودەست لۆمە و سەرزەنشتی خۆمم کرد: خۆکوشتنی ئینسانێك ببێ بەکەرەستەی نووسینی نووسەران؟ ئایا ئەرکی نووسەر ئەوەیە هەست بە بوونی کێشە بکات و بیخاتە بەرچاو، تا بەلایەنی کەم هەوڵی چارەسەر کردنی کێشەکە بدرێ، یان دۆزینەوەی زەخیرەی نووسین و نێوبانگ دەرکردن بە نوسین؟ لەناخی خۆمدا گلەییم لەخۆم کرد کە ئەم دەربڕینەم بەمێشك دا هات.

هەواڵە بەپەلەکان لەشاشەی تەلەفزیۆنەوە زیاتر سەرنجی ڕاکێشام: خۆکوژەکە بە کەرتە شوشەی پەنجەرە کۆتایی بە ژیانی خۆی هێناوە .

ئەمە هەواڵی بەپەلەی دوای دوو هەواڵەکەی پێشوو بوو .

بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی مرۆ پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات؟ ئایا دامەزراوەی تایبەتمەند ناتوانێ ڕێژەی خۆکوشتن کەم بکاتەوە، بەوەی خۆکوژەکان لەو ڕاستییە تێبگەیەنن کە هەموو کەسێك دەیەها ڕێگای تری لەبەردەم دایە بۆ خۆ قوتار کردن لە تەونی کێشەکان؟ ئایا پێویست نیە دامەزراوەیەکی کارای کۆمەڵایەتی و شارستانی هەبێت، تا لە هۆکارە دەرونی و ژینگەیی و کۆمەڵایەتیەکان بکۆڵێتەوە کە پاڵنەرن بۆ خۆکوشتن ؟ ئایا مینبەرێك نیە وا لە خەڵك بکات لە کاتی هەبوونی کێشە و لەجیاتی خۆپەلکێش کردن بەرەو مردن، ئاراستەی ژیانیان

پێبگۆڕێ بەرەو جیهانی خۆشبەختی و بێئومێدی لە دەروونیان بڕەوێنێتەوە و هیوایان پێبدات و متمانەیان پێببەخشێت کە ئەم مینبەرە دەتوانێ گرێ کوێرەکانی ژیانیان بۆ بکاتەوە؟ بە خۆمم گوت: نابێ مرۆ بۆ خۆقوتار کردن لە کێشە خۆی بکوژێت، بەڵکو ئەقڵی وەگەڕبخات بۆ دۆزینەوەی یەك لەو دەیان ڕێگایەی مرۆ ڕزگار دەکات لە کێشە و تەنگوچەڵەمە و بگرەوبەردەکانی ژیان.

لەناو ئەم هەمووو بیرکردنەوە و تێڕامانە زەنگی تەلەفۆنەکەم بەئاگای هێنامەوە و بیرکردنەوەکانی پچڕاندم، دەمێك بوو چاوەڕوانی ئەو تەلەفۆنە بووم، ئیدی دەبوو بەرەو فڕۆکەخانە بەڕێبکەوم، هێندەی پێنەچوو تاکسیەکە گەیشت و هەردوو جانتاکەم سەرخست، دڵم خێرا خێرا لێی دەدا ئیتر ئەوپەڕی هەشت نۆ کاتژمێری تر دەگەمەوە باوەشی نیشتمان، دە ساڵ کەم نیە هەناسەیەکت لە باوەشی نیشتمان هەڵنەمژیبێ و بۆنی خاکت نەکردبێ کە یەکەم نمەو گڕوفڕی پایز تەڕی دەکات، دە ساڵ زۆر زۆرە کاتێك درەخت و گوڵە قامیش و لیلك و کرتی و زەل و چڵپاوی ناو کۆڵانەکان و لوتکەو تیشە شاخ و زەنوێر و دۆندەکان و کانی و کارێزو ڕووبار و بنچك وبواری نیشتمانت نەبینیبێ.

بەخۆمم گوت: کوانێ دڵم بە بینینی بەفر و شەختە و زوقم و تیشە شاخ و دۆڵ و لاپاڵی ئێرە دەکرێتەوە، لەگەڵ هی کوردستان تەنها خوایان یەکە.

دە ساڵ لای من ببوو بەقرنێك، بەفر لە داباریـن بەردەوام بوو، شاری کردبوە هێلکەیەکی سپی سپی، لە دورەوە شار بوکێکی باڵا بەرزی بە تارا داپۆشراو بوو.

لەناو فڕۆکەکەش دڵم لای نیشتمان بوو، لە پەنجەرەی فڕۆکەکەوە لەسەرەوەی گلۆڵەی هەورە سپی و تێکچڕژاوەکانەوە تارمایی نیشتمانی نەتەوەکانی ترم دەبینی: ئەمە نیشتمانی ئینگلیزەکانە و خاوەنی سنووری سیاسی خۆیانن «کەس ناتوانێت ئەو سنوورە تێکبشکێنێت، ئەمەشیان نیشتمان و سنووری بولگاریەکانە، ئێرەش هی یۆنانیەکان، لە ئاسمانی ڕۆژهەڵات پەنجەم بۆ نیشتمانی تورکان درێژ کرد، لەملاتر نیشتمانی عەرەبان و فارسەکانم بەدیکرد.

ئەم پرسیارەم لەخۆم کرد: بۆچی نەتەوەکانی تر نیشتمانیان بوە بە دەوڵەت بەڵام نیشتمانی ئێمە نابێ؟ ئەم پرسیارەیش لەتۆ دەکەم: بۆچی بەناوی ئاینەوە ئەم نیشتمانە خوداییە بکرێ بە دۆزەخ؟ خۆزگەم دەخواست منیش وەك ڕۆڵەی نەتەوەکانی تر بە پاسپۆرتی کوردستانەوە گەشتی ئەم وڵات و ئەو وڵاتم بکردایە.

## (٢)

دووەمین ڕۆژی گەیشتنەوەم بە شاری هەولێر، بەپێی ئەو ناونیشانەی پێم درابوو، هاتمە بازاڕی فەقیران، هاتوهاواری فرۆشیار و بێنەوبەردە و بۆڵەبۆڵی مشتەریەکان، بازاڕە بچوکەکەی پڕ کردبوو، لە هەردوو سەری بازاڕەکەوە گوێت لە قیڕە و بانگەبانگ و هاواری فرۆشیارەکان دەبوو کە دەیانویست بەو هاوار و بانگ کردنە مشتەریەکان بۆ لای خۆیان ڕاکێشن و کاڵا و کەلوپەلەکانیان لەو ڕۆژەدا ساغ بکەنەوە، نێو دوکانەکان پڕ بوون لە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ و جلوبەرگی ژنانە و منداڵان و پیاوان و جۆرەها کەلوپەل و کەرەستەی خانووبەرە و بیناسازی و کارەبایی، لەبەردەم دوکانەکانیش لەهەردوو بەرەوە بەدرێژایی بازاڕەکە عەرەبانەی سێ تایە ڕاگیرابوون کە سەریان پڕ بوو لە میوەی هەمەچەشن و سەوزە و تەڕە، ژێر پێی مشتەری و فرۆشیارەکان چڵپاوێکی پیس بوو کە بەهۆی خۆڵ و خاشاك و تۆز و گەردی شەقامەکانەوە دروست ببو و لەژێر پێی هاموشۆکاران دەپلیشانەوە و زڵچەیان دەهات و بۆنێکی ناخۆشی پەرشوبڵاو کردبووەوە.

فرۆشیاران بۆ گەرم کردنی بازاڕی خۆیان بانگیان ڕا دەدا و هاواریان دەکرد، فرۆشیارێکی قەڵەوی تێکچەقاو و قسەزان دەینەڕاند:

-وەرنەوە بۆ تەماتە و سێوی ئێرانی.

لەولاتر پیاوێکی سورەی موو زەردی کوڵەبنەی جامانە لەسەر بانگی ڕا دەدا:

-وەرن لێرە پەتاتەی تورکی بکڕن هەرزانمان کرد.

لەولاترەوە دوو پیاوی پیری ڕیش ماشوبرنجی قورئان خوێن بەدەم یەکەوە دانیشتبون و هاواریان دەکرد :

-وەرن خورمای ئێرانی و عەرەبی ببەنەوە ماڵەوە، پیرۆز و متفەڕکە و بیست عیللەت دەپەڕێنێت.

هەر لەڕێزی ئەوان پیاوێکی لەڕ و لاواز و یەکێکی تری قەڵەو و کەتە هاوار هاواریان بوو بۆ ڕاکێشانی مشتەری، حەتمەن ئەوانیش میوە و سەوزەی دەرودراوسێیان هەبوو، ئیتر هەر فرۆشیارە و کەلوپەل و میوە و تەڕەی وڵاتێکی هاوسێی دەفرۆشت و بانگی بۆ ڕادەدا، تەنها میوە و تەڕە و خۆراکە خۆماڵیەکان نەبێت.

هەردوو سەری بازاڕەکە بە بەربەستی کۆنکریتی گیرابوون و ڕێی هاتوچۆی ئۆتۆمبیلیان نەهێشتبوەوە، لەپێناوی کەمکردنەوەی جەنجاڵی شەقامەکە کە سیخناخ بوو لە خەڵك، تەنها بواری هاتنە ژوورەوەی عەرەبانە و پیادەڕۆکانیان هێشتبوەوە.

زۆرینەی ئەهلی شار، جگە لە دەوڵەمەندو کەسانی دەستڕۆیشتو، ڕۆژانە ڕوویان لەم بازاڕە دەکرد و پێداویستیەکانی خۆیان دەبردەوە ماڵەوە، چوونکە نرخی شتومەك و کاڵا و سەوزە و میوە بەراورد بەشوێنەکانی تر هەرزانتر بوو، لێرە لەم بازاڕە بچکۆڵانەیە فرۆشیاران قازانجێکی کەمیان دەخستە سەر

کەلوپەل و میوە و سەوزە و کەرەستەکانیان، بەمەش مشتەری زۆریان بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو، ئەمەش هونەرێکی تازەی فرۆشیاران بوو، تا زۆرترین کاڵاو کەلوپەل بفرۆشن و بازاڕی خۆیانی پێ گەرم بکەن و لەدوای دەستمایە بڕێك قازانج بخەنە گیرفانیانەوە، فرۆشیارانی ئەم بازاڕە گەرچی لە شێوە و باڵا و ڕوخسار لە یەکتر جیاواز بوون، بەڵام لە جوڵاندنی بازاڕ و هونەری کۆکردنەوەی مشتەری تێگەیشتن و مامەڵەیان لە یەکتر دەچوون و بە ڕۆژانەیەکی ئاسایی و ئەو شێوە ژیانەی هەیانبوو ڕازی بوون.

بەکورتی بازاڕەکە بازاڕی خەڵکی نەدار و هەژار و دەستکورت و کرێچی بوو هەر ئەوانیش بەلێشاو ڕویان تێدەکرد و بازاڕەکەیان گەرم کردبوو بۆ فرۆشیاران، بۆیە خەڵك ناوی بازاڕەکەیان لەبازاڕی ( قەڵا )وە گۆڕیبوو بۆ بازاڕی فەقیران.

لەو پێدەشتە قەڵا باڵای بەرزترە لە هەموان دیوارەکانی لە قەد و باڵای پیرە پیاوێکی بەساڵاچوو دەچێت کە شەکەت و ماندوو، بەڵام بەهێز و پتەو دەربکەوێت، گوێسوانەکانی لە ڕیشی پیرە پیاوەکە دەچێت بەجۆرێك هەر تاڵە موویەکی سپی خاوەنی دەیان حیکایەتی هەزاران ساڵەی شارەکە بێت و مێژووی میللەتێکی تیا هەڵگیرابێت.

قەڵا ساڵی سەدان جار لەگەڵ هەور دا کۆدەبێتەوە و چیرۆك بۆ یەکتر دەگێڕنەوە، هەور باسی گرمەگرمی خۆی و نمە باران و تەرزەی ئەو پێدەشتەی بۆ دەکات و خوڕەی جۆگەلەکانی بەگوێدا دەچرپێنێت و تریشقەکانی وەبیردێنێتەوە، قەڵاش باسی سوارچاکانی دەڤەرەکە و سەرجۆنی ئەکەدی و

ئەسکەندەری مەکەدۆنی و هۆلاکۆ و سوڵتان مزەفەری بۆ دەکات، ئەو بۆ ئەهلەکەی تاوێك دەگری، دەگری دەگری تا فرمێسکەکانی جۆگەلە دەبەستن و درەختە کزربووەکانی دەوری شار ئاو دەدەن، تاوێکی تر پێدەکەنێ، قاقای دەگاتە ماڵ بەماڵی ئەو پێدەشتە، مەبەستیەتی ئەهلی شار لەگەڵ پێکەنین ئاشتبکاتەوە، ئیتر شەوانیش ئیشکیان لێ دەگرێ و دەبێ بە پاسەوانی ڕۆحیان.

لە بازاڕی فەقیران کە کەوتبوە دیوی ڕۆژهەڵاتی قەڵای هەولێر، وەستا یاسین یەکێکە لە کاسبکارانی گوزەرەکە و لە قولغێك کە درێژیەکەی لە دوو مەتر و پانیەکەشی لە مەتر و نیوێك زیاتر نەبوو کاروباری چایخانە بچووکەکەی بەڕێوە دەبرد، لەو قولغە تەنگەبەرە تەباغێکی غاز و کتریەکی ستیل و قۆریەکی فەخفوری و دوو سینی و هەشت نۆ پیاڵە و سەللەیەکی خاشاکی دانابوو، بەمەش بەحاڵ جێی ڕاوەستان و خولانەوەی خۆی تیا دەبووەوە، بۆیە بەناچاری کورسیەکەی لەبەردەم دوکانەکە دانابوو، تا هەر کات دەستبەتاڵ بێت لەسەری پشویەك بدات، یان ئەگەر مشتەریەکی خۆشەویست ڕووی تێبکات لەسەری داینیشێنێت.

لەبەردەم وەستا یاسینی چایچی ڕووەو قولایی بازاڕەکە وەستابووم، دەمڕوانیە دیمەنی کڕیار و فرۆشیاران و هەڵڵاو هەنگامەی ئەو بازاڕە بچکۆلانەیە، دوکاندارەکان لەوێ تەنها فرۆشیار بوون نەك شتی تر، لەوێ گەرویان دەنوسا و دەنگیان دەکەوت بە هاتوهاوار و بانگهێشت کردنی مشتەریەکان، کاریان دەکرد و خۆیان ماندو دەکرد بۆ ئەوەی دوای بانگی ئێوارە بڕێك

خەرجی ببەنەوە بۆ منداڵەکانیان، هەر ئەم دوکاندارانە لە شوێن و بازاڕی تر دەبوون بە مشتەری و کڕیار بۆ پێداویستیەکانی تری ژیانیان و لە فرۆشیارەوە دەبوون بە کڕیار.

گەرچی یاسینی برات منی نەدەناسی، بەڵام بە کورتە گفتوگۆیەك ئاشنایەتیمان پەیدا کرد و فەرمووی لێکردم لەسەر کورسیەکە دانیشم، دەمودەست چایەکی گەرمی بۆ هێنام کە هاڵاوی لێهەڵدەستا، لەو کورتە گفتوگۆیە لە بارودۆخی ئەو بازاڕە جەنجاڵە و لە هۆکاری ئەو چڵپاوەی ژێر پێی فرۆشیار و مشتەریەکان و لە حاڵ و گوزەرانی خۆیم پرسی.

وا دەهاتمە بەرچاوی کە ڕۆژنامەنوس بم، گەرچی واش نەبوو، ئەم تێگەیشتنەیشی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو چەند پرسیارێکم ئاراستە کرد کە پرسین بوو لە بارودۆخی بازاڕەکە و شێوەی ژیانیان و ئاستی بژێوییان و هۆکاری ئەو چڵپاوەی ژێر پێیان، جگە لەمەش ڕێکپۆشیەکەم سەرنجی وەستا یاسینی بۆ ئەوە برد ڕۆژنامەنوس بم، لەڕاستیش دا من نوسەرم نەك ڕۆژنامەنوس.

وەستا یاسین ناوە ناوە منی جێدەهێشت و ناو هەردوو لەپی پڕ دەکرد لە پیاڵە چایە و لەسەر داوای خۆیان دوکان بە دوکان و عەرەبانە بە عەرەبانە چایەی پێدەدان، سەرسام بووم بەوەی لەناو یەك لەپیدا چەندین پیاڵەی پڕ لە چای هەڵدەگرت و دەیگێڕا و بە خێراییەکی زۆر دەیبرد بێ ئەوەی بهێڵێ یەك دڵۆپە چای لێ بڕژێت، (چای گێڕانیش لێهاتویی و شارەزایی باشی دەوێ و جۆرێکە لە هونەر ) لەدڵی خۆمدا وامگوت.

بەکورتیەکەی وەستایەکی کارامە و شارەزایەکی باشی چای لێنان و چای گێڕان بوو.

زۆربەی گوزەرەکە مشتەری وەستا یاسین بوون، گەرچی چایچی تریشی لێبوو، ناوە ناوە هەریەکە و بەجۆرێك بانگی یاسینیان دەکرد:

-یاسە دوو چای بێنە.

-یاسینۆك چایەکی خەفیف بەس زووکە.

-وەستا یاسین چایەکی تاڵ و چایەکی شیرین بێنە.

-کاکە یاسین سێ چای جوانمان بۆ بهێنە.

-حەمە یاسین میوانم هەیە پەلە بکە.

وەستا یاسین ڕاهاتبوو لەو جۆرە بانگ کردن و ناوهێنان و ناولێنانە، دڵیشی گەورە بوو لەئاست مشتەریەکانی گەر بەهەر ناوێك بانگیان بکردایە، مشتەریەکانیش ئەویان خۆشدەویست و خاتریان دەزانی، لە خۆشەویستیشدا زۆر جار بە { یاسە } بانگیان دەکرد، ئەو شەرواڵێکی کوردی ڕەنگ قاوەیی و کراسێکی جەرگی لەبەر بوو، کراسە جەرگیەکەی تا لای ئەژنۆی شۆڕ ببوەوە کە لەلایەن لێژنەکانی چاودێری تەندورستیەوە بۆی دیاری کرابوو تا لە کاتی کارکردن دا تەنها ئەو جۆرە کراسە بپۆشێت، گەر کراسە جەرگیەکەی نەپۆشیبا، بە سەرپێچی بۆی ئەژمار دەکرا و لەلایەن لێژنەکانی چاودێری تەندروستی شارەوە سزا دەدرا، بەروانکەیەکی سپی بەمل و سینگیدا شۆڕ ببوەوە تا خوار ناوکی و لەپشتەوەی ملی بەگرێدان قایمی کردبوو، زۆر جار گرێکە دەبوە گرێکوێرە و ناچار دەبوو بە دوکاندارێکی

هاوسێی بیکاتەوە، چوونکە دەستی نەدەگەیشتە دواوە، بەو بەروانکەیە دەیویست جلەکانی بەری لە پیسبوون بپارێزێ و بەخاوێنی بمێننەوە.

گەرچی بازاڕۆچکەکە جەنجاڵ و پڕ لە قوڕ و لیتە بوو، بەڵام هیچ لە گورجوگۆڵیەکەی کەم نەکردبوەوە، هێندە دەست و برد خواستی مشتەریەکانی جێبەجێ دەکرد، پێڵاوەکەی پێی کالەیەکی سپی بوو، وا دەهاتە بەرچاو تین و گورجوگۆڵی پێ بەخشیبێت، کالەکە تا نیوەی زیاتر لە هەر چوار لاوە بەهۆی هاتوچۆ و چای بردن و هێنانەوەی پیاڵە بەتاڵەکانەوە بەقوڕ و چڵپاو سواخ درابو و ڕەنگی لە سپییەکی تۆخەوە گۆڕیبوو بۆ ڕەنگی بۆرێکی مەیلەو تاریك، چڵپاوەکەی پێوە نوسابو و ڕەق ببوەوە دەتگوت هەر لە بنەڕەت دا ڕەنگی کالەکە بۆر بوە نەك سپی، کالەکەی تایبەت کردبوو بەکاری چایخانەکەی، کە ئێواران دەگەڕایەوەماڵەوە پێڵاوە زەهەبییەکەی لەژێر مێزەکە دەردەهێنا و کالەکەی دەخستە شوێنی تا ڕۆژی دواتر.

ئەو ڕۆژەی من لای بووم و ئەو بە ئەفەندی بانگی دەکردم، درەنگ دوکانەکەی کردبوەوە، زۆربەی دوکاندارەکان بۆڵەبۆڵیان لێ پەیدا ببو و دەیانگوت لە بەیانیەوە بۆ سەرسەری و خوانەناسێك بێ چایەی کردوین، ئەوان دەیانزانی یاسین هاتۆتە بەندیخانە و سەردانی تۆی کردوە، دەیانویست هەر نەیەتە سەردانت و پشتگوێت بخات. یەك لە دوکاندارەکانی هاوسێی بە دەنگی بەرز بە دوکاندارەکەی تەنیشتی دەگوت:

-برایەك ببێت بە تیرۆرست و بیەوێ خەڵکی شارەکەی خۆی بکوژێت و ژن و منداڵی گەڕەکەکەی ئەتك بکات، هەر بۆ ئەوە

باشـە لـە بەندیخانـە داڕزێ.

کـە دەنگیشـی بـەرز دەکـردەوە، مەبەسـتی بـوو یاسـین گوێـی لـێ بێـت، تـا بەهـۆش بێتـەوە.

دوکاندارەکەی تر قسەکانی وەرگرتەوە و گوتی:

-حکومـەت حکومـەت بێـت هەموو خەڵکـی هەولێر لـە دەوروبەری قـەڵا کـۆ دەکاتـەوە و لەبـەر چـاوی هەمـوان گـولله بارانـی دەکات، ئنجـا پـارەی فیشـەکەکانیش لـە یاسـە وەردەگرێتەوە.

بـەو مـاوە کەمـەی لـەو بـازاڕە ڕامابـووم، لـەوە تێگەیشـتم کـە هەمـوو ئەهلـی گوزەرەکـە یاسینیان خۆشـدەویێت، بـەڵام ڕقیـان لـە تـۆ دەبـوەوە، پیاڵـە چایەکـەم هـەر بەدەسـتەوە بـوو، فڕێـك یـان دوانـی تیـا مابـوو، هـەر تەماشـای ڕوخسـاری یاسـینم دەکـرد، دەتگـوت بـەم تەماشـاکردنە ئـەم پرسـیارەم لێکـردوە:

-براکەت لەسەرچی گیراوە؟

ئەویـش وەك ئـەوەی لـە ڕامانـی من ئـەو پرسـیارەی خوێندبێتەوە، بـێ ئـەوەی ئـەم پرسـیارەی لێبکەم خـۆی هەڵیدایـێ و گوتی:

-براکەمیـان تـوش کـرد، فەقیـرە ئـاگای لەهیـچ نەبو و نوێـژ و ڕۆژو و تاعەتـی خـۆی دەکـرد، بـەڵام پەلکێشـی نـاو گرووپێکـی ئیسـلامی توندڕەویـان کرد.

بـە دەم قسـە کردنەوە پیاڵـە بەتاڵەکانی دەشوشـت و بە پەڕۆیەکی شـێدار سـەر مێزەکـەی دەسـڕیەوە، کتریەکـەی پـڕ ئـاو کـردەوە و خسـتیە سـەر غازەکـە، تەماشـایەکی منـی کـرد، لەبـەر خۆیـەوە

قسەی دەکرد:

-هێشتا مەمنوونم بە بەندکردنی هەتاهەتایی، پاش دوو ساڵ لە حوکمەکەی قەول وایە داواکاری گشتی لەسەر داوای کەسوکاری دوو قوربانی حوکمەکەی تەمیز بکاتەوە، ترسم لەوەیە حوکمەکەی بگۆڕن بۆ لەسێدارەدان، بەستزمانە هیچ تاوانێکی ئەنجام نەدابوو وەك ئەوانەی تر، بەڵام بە ئاگری ئەوانەوە سوتا و بە بەندکردنی هەتا هەتایی حکوم درا، چیبکەم برامە و لێم ناشوریێ، ناچارم سەردانی بکەم و چاوم لە منداڵەکانی بێت و دەستیان بگرم.

بێ ئەوەی من پرسیاری لێ بکەم ئەم باسی وەزعی تۆی بۆ دەکردم، گەرچی ڕووی لە من بوو، بەڵام لەوە دەچوو قسەکانی وەڵامێك بێت بۆ هەردوو دوکاندارەکەی تەنیشتی، نەك قسەکردن بوبێ بۆ من، قسەکانی لە هەڵەوەڕی و زۆر بڵێیی نەبوو، بەڵکو دەربڕینی کۆڵێك خەم بوو .

لەسەر کورسیە پلاستیکەکە کە لاشانێکی هەڵپچڕابو و بەتێلی باریك دورابووەوە ڕوانیمەوە یاسین و لێم پرسی:

-چۆن دەبێت کەسێك هیچی لە هیچ دا نەبێت و حوکمی هەتا هەتایی بەسەردا بسەپێنرێت؟

-ئەفەندی گیان، تاوانی براکەم تەنها ئەوە بوە ناوی لەو لیستە تۆمار کرابو کە ناویان گروپی تەکفیریە و هەندێك کردەوەیان دژ بە حکومەت ئەنجام دابوو، براکەی من هیچی نەکردبوو بەسزمانە تەنها مسوڵمانێکی پاك بوو، ئەوانەی تر تاوانبار بوون نەك براکەی من، ئەوەتا لەم یەك دوو ڕۆژەی پێشوو، یەکیان

لە بەندینخانە خۆی کوشت، ئەگەر تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت بۆ خۆی دەکوژێت؟ بۆچی براکەی من خۆی ناکوژێت، دیارە هیچی لەهیچ دا نیە.

هەواڵی خۆکوشتنی بەندیەکە بۆ من تازە نەبوو، بەڵکو یەك دوو ڕۆژ بەر لەوە لە تەلەفزیۆنەوە گوێبیستی ئەم هەواڵە ببووم، بەڵام دووبارە گوێبیست بوونەوەی هەواڵەکە ڕێی گەیشتن بە چیرۆکی خۆکوشتنەکە و هۆکارەکانی ئاسان تر کرد بۆم.

دیسانەوە لەخۆمم پرسی: بۆچی دەبێ مەردوم پەنا بۆ خۆکوشتن بیات؟

دواتر لە یاسینم پرسی: براکەت لەگەڵ ئەو کەسە بەندی بوو کە خۆی کوشت ؟

بانگەبانگی یەك لەدوای یەکی مشتەریەکان بواری یاسینیان نەدا وەڵامم بداتەوە، غارێك بۆ دوکانەکەی حەمیدی کارەباچی، غارێکی تر بۆ دوکانی مەغدیدی تەماتە فرۆش، پێیەکی بۆ لای هێمنە سور، پێیەکی تری بۆ لای جەعفەری لەفە فرۆش، ئیدی بواری نەبوو سەری خۆی بخورێنێت، چ جای وەڵامدانەوەی غەریبەیەکی وەك من.

کات بەرەو نیوەڕۆ دەڕۆیشت، زۆربەی دوکاندارەکان ژەمی نیوەڕۆیان بە خواردنی سەفەری سەر عەرەبانەکەی جەعفەری لەفە فرۆش بەڕێدەکرد، هەر بۆیە دوای ئەو بەرکوڵە لە هەموو لایەکەوە بانگی وەستا یاسین دەکرا بۆ چای.

لەشوێنی خۆم هەستام و دەستمکرد بە شوشتنی ئەو چەند

پیاڵەیەی لەسەر مێزەکە مێش تێی ئاڵابون، دەمزانی وەستا یاسین بواری کەمە و ناپرژێتە سەر تێر کردنی تەواوی گوزەرەکە، بۆیە بەشێك لەکارەکانیم کەم کردەوە، دەبوو لای بمێنمەوە تا بتوانم سەردانی تۆ بکەم و گوێ لە سەرگوزشتەت و چیرۆکی خۆکوشتنی بەندیەکە بگرم، بۆیە نەدەبو هاورێیەتی چایچیەکەی بازاڕی فەقیران لەدەست بدەم.

ئارەقەی شین و مۆری کردبوو، لولەی قۆریە فەخفوریەکەی شۆڕکردەوە ناو ئەو چەند پیاڵە خاوێنەی بۆیم شتبوو، بە دەستی چەپی دەسەسڕە نارنجیەکەی لەگیرفانی دەرهێنا و دەموچاوی سڕیەوە کە بە ئارەقە بریقەی دەدایەوە، لەسەر کورسیەکە هەستام و هەنگاوێك لێی چوومە پێشەوە، دیسان هەمان پرسیارم لێ کردەوە: براکەت لەگەڵ ئەو کەسە بەندی بوو کە خۆی کوشت؟

وەستا یاسین وەك ئەوەی گوێی لێ نەبوبێ هەردوو لەپی پڕ کردەوە لە پیاڵە چایە، بە نەرمە لۆقە بەرەو لای مشتەریەکانی ڕۆیشت.

بەخۆمم گوت : فەقیرە ناحەقی نیە وەڵام نەداتەوە، پێڕا ناگات گوزەرەکە تێر چایە بکات.

دوای تێرکردنی گوزەرەکە، هاتوهاواری فرۆشیاران و جموجۆڵی مشتەریەکان و بانگەبانگی دوکانداران بۆ چای کەمی کرد و کپ بوەوە، وەستا یاسین بۆ لاکردنەوە لێم و پشودانێك لە نزیکم لەسەر زەویەکە دانیشت و جگەرەیەکی داگیرساند، ئنجا ڕوی تێکردم و گوتی:

-ئێ مامۆستا خێرە لە چێشتەنگاوەوە لێرەی؟ وەك بڵێی قسەیەکت پێبێت و نەیدرکێنی.

-لە ئەوروپا گەڕاومەتەوە و ئامانەتیەکم پێبوو بۆ دوکاندارێکی ئەم گوزەرەی ئێوە، ناوی ئیسماعیله.

-ئەها ................ سمه چڵکن نەڵێی ؟

-باوکی ناوی جەلالە؟

-ئێ ئێ هەوە خۆیەتی سمه چڵکنەکەی خۆمانە، خۆ یەك سمایل لەم گوزەرە هەیە، ئەی بۆ لەبەیانیەوە دەنگ ناکەی ؟ ئەفەندی گیان تۆش سمه چڵکنت لێکردوین بە ئیسماعیل، ئەها ئەو دوکانەی سوچی سەرەوە لە دەستی ئەوبەر هەوە، بانگیبکەم ؟

-خۆ جارێ نارواتەوە؟

-نا بابە، تا ئێوارە لێرە دەبێ، گەر ئێرە وەك دۆزەخیش بێت لە ماڵی خۆی خۆشترە. (ئەمەی بە پێکەنینەوە گوت).

هەنگاوێك لە یاسین نزیك کەوتمەوە و بە زەردەخەنەوە پێم گوت: جارێ کارم بە تۆیە نەك بەو، کاری ئەو ئاسانە، بڕێك پارەی بۆ هاتۆتەوە و دەیدەمە دەستی.

وەستا یاسین چاوەڕێی نەدەکرد بابایەکی غەریبەی وەك من کارم بەو بێت، بۆیە بەسەرسوڕمانەوە گوتی: من ؟

-بەڵێ تۆ.

(٣)

سێیەم ڕۆژی هاتنەوەم لەشەقامی باتەوە بە پێ بەرەو ڕۆژهەڵاتی قەڵا هەنگاوم دەنا، دەمویست هەرچواردەوری قەڵای هەولێر تەی بکەم و خۆم مەست بکەم بە دیمەنەکانی، تێر تێر دیقەتی شار بدەم و یادەوەریەکانی سەردەمی گەنجی خۆم بە ئێستاوە گرێبدەم، کە لە پتەوی قەڵا ڕادەمام، ئەو پرسیارەم لا دروست دەبوو ئاخۆ کام پاشا و کام فەرمانڕەوا فەرمانی دا قەڵای هەولێر لەم دەشتە پان و بەرینە دروست بکرێت؟ ئەی کێ ئەندازیار و نەخشەسازی قەڵاکە بوو؟ کام وەستا و کرێکار خشتەکانیان دانا، خشتەکانیان لەکام کەرەستە دروست کرد؟ سەیرە هەموو کەس ناوی فەرمانڕەوا و پاشاکانی هەولێر دەزانێت و دەشزانن چەند جەنگ لێرە ڕویداوە و کێ سەرکەوتوو بوە و کێش بەزیوە و شکاوە، بەڵام نازانن کێ بوو یەکەم خشتی قەڵاکەی دانا، کێ ئەندازیار و نەخشەساز و کێ وەستا و کرێکاری دروستکردنەکە بوون، بەکورتیەکەی ناوی پاڵەوانانی دروست کردن و ئاوەدانی لە لاپەڕەکانی مێژودا ونن، کەچی ناوی پاڵەوانانی جەنگ وەك توتی دەگوترێتەوە و بە خەتێکی درشت لەلاپەڕەکانی مێژوودا نوسراون، بەخۆمم گوت : تۆ بڵێی ئەو سەردەمە زانکۆ هەبووبێت تا ئەندازیاری وتو وریا و کارامە پێبگەیەنێت؟ دەبێت ئەوسا قەڵەم و کاغەز و لیقڵ و ئامێرەکانی بەرزکەرەوە و داگرتن و بارکردن و گواستنەوە هەبووبن، تاکو قەڵایەکی وا پتەو دروست بکەن کە بە چوار

هەزار ساڵ زیاتریش خشتێکی لەق نەبێت و لەرزۆك نەبن و بەسەریەك دا نەڕوخێن؟ ئایا دەبێت کارگەی بەرهەمهێنان و دروستکردنی خشتیان هەبوبێت بەجۆرێك هیچ خشتێك لەوەی تر نە گەورەتر بێ نە بچوك تر بێت؟

لە دیوی باشووری قەڵا سەرم کێشا بە کتێبخانەی سیروان دا، شێوەی کتێبخانەکەم وەك شێوەی قەڵا هاتە بەرچاو، کتێبەکان لەناوەڕاستی ژوورەکە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دانرابوون و لە هەرچوار لاوە کۆڵانێکی تەنگەبەری بۆ هێشترابووەوە، تاکو خوێنەران بتوانن بە ئاسانی ناونیشانی هەموو کتێبەکان ببینن، لە هەنگاوی یەکەم دا زەینم چوە سەر کتێبی فەلسەفەکانی ژیان، چاوێکی خێرام گێڕا بە پێشەکی و لاپەڕەکانی تری دا، تەماشای زۆربەی ناونیشانی کتێبەکانی تریشم کرد، لەبەردەم دەرگاکە پارەی کتێبەکەم دایە خاوەنی کتێبخانەکە، هێشتا بەتەواوی خۆم کۆنەکردبووەوە و پێم نەخستبوە دەرەوە لە دوکانێکی بەرانبەریان دەنگی تەقەیەك هات، چەند چرکەیەکی پێنەچوو دەروجیران و هاموشۆکەرانی شەقامەکە دارژانە شوێنی تەقەکە و بوە هاتوهاوار، منیش بەرەو قەرەباڵغییەکە هەنگاوم نا، لە ماوەیەکی کەم دا بەردەم دوکانەکە پڕ بوو لە خەڵك، هەر یەکە و بە جۆرێك قسەی دەکرد:

-پەکو دەبی لۆ ڕەزاق خۆی کوشتبێت.

-بەستەزمانە ڕوحی تیا نمایە.

-وەیش داخوا چەند منداڵی لەپاش خۆی بەجێهێشتیە.

-دەستی لێمەدەن تا پۆلیس دێت.

-بێ هۆ نیە خۆی کوشتیە.

لە گەنجێکم پرسی: چی ڕویداوە؟ گەنجەکە گوتی: ئەم دوکاندارە خۆی کوشت، دوکاندارەکە خوێن لە تەوقی سەریەوە فوارەی دەکرد بۆ سەر ڕومەت و چەناگەو سینگی، دەمانچەکەی قولانجێك لە دەستی ڕاستیەوە دوور بوو، کەس دەستی بۆ نەدەبرد، چاوەڕێی هاتنی پۆلیسیان دەکرد، تاکو ڕێکاری یاسایی بگرنە بەر.

دیسانەوە لە خۆمم پرسی بۆچی مرۆڤ خۆ کوشتن بە باشترین چارەسەر دەزانێت؟ چیبکرێ بۆ ئەوەی مەردوم ڕێگای ڕاست بدۆزێتەوە لەجیاتی خۆ کوشتن؟

لەلام گرنگ بوو بزانم بۆچی ئەم دوکاندارە خۆی کوشت، خۆ کوشتنی دوکاندارەکەم خستە ناو بەرنامەی نووسینەکانمەوە، تا لەدوای خۆکوشتنی بەندیە ئیسلامییەکە لە هۆکارەکەی بکۆڵمەوە، ئەو ڕووداوە بیرکردنەوەی ئاڵۆز کردم و توانام نەما دەوری قەڵا بپێوم، هۆرتە هۆرت بەرەو ماڵی ئامانجی برام گەڕامەوە، بۆ ئەو چەند مانگەی کە دەمویست لە کوردستان بمینێمەوە، قاتی دووەمی ماڵی ئامانجم کردبوە شوێنی حەوانەوە و خەوتن و پشودانی خۆم، ئێوارەی هەمان ئەو ڕۆژەی ڕووداوی خۆکوشتنی دوکاندارەکەی تیا ڕوویدا لە ژوورێکی چوار بە چواری پاك و تەمیزدا خەریکی خوێندنەوەی کتێبی فەلسەفەکانی ژیان بووم، هێشتا بیرو هۆشم لای دوکاندارەکە بوو، گەرچی خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکەش بووم، بەڵام ڕووداوی خۆکوشتنی دوکاندارەکە، بیروهۆشیان زەوت کردبووم، لە پێشەکی کتێبەکەدا هۆکاری نووسینی کتێبەکە نوسرابوو،

نووسـەری پێشـەکیەکە نووسـی بـووی لـەم کتێبـەوە فێـر دەبێـت چـۆن بژیـت و کامـە ڕێـگا ڕاسـت و ڕەوایە کـە ژیانی خۆتی لەسـەر بونیـات بنێـی؟ لـەوە تێدەگـەی بۆچـی خـۆ کوشـتن چارەسـەری دەرد و کێشـە و گرفتەکانـت نـاکات، بۆچی نابێـت خۆمان بکوژین؟

منیـش عەودالـی وەهـا کتێبێـك بـووم کـە سـوودم پێبگەیەنـێ لـە لێکۆڵینـەوە و بەدواداچونەکانـم بـۆ ئـەو دوو حاڵەتـی خۆکوشـتنە، کاغـەز و قەڵەمەکـەم دەرهێنـا، بـۆ ئـەوەی تێبینیەکانـی خـۆم لەبـارەی کتێبەکە بنووسـم، کاتێـك زریکە و هـاواری ژنێکم بەرگوێ کـەوت، قیـژە و هاوارەکـە درێژەی کێشـا، تا دەهات ژمـارەی ئەوانە زیـادی دەکـرد کـە دەگریـان و بـراڕۆیان بوو، داد و فیغـان و گریان و هاتوهاوارەکـە گەڕەکـەی تەنییـەوە.

بەخۆمم گوت:

-شتێك ڕوویداوە.

لـە کۆڵانـی تەنیشـتیان غەڵبـە غەڵـب و دەنگـە دەنـگ و فـڕکان فـڕکان زیـادی کـرد، خۆم نەگـرت بە قادرمـەکان دا هاتمـە خوارەوە پێموابـو شـتێك قەومـاوە، بانگـی براژنم کـرد: ئەو گریـان و هەرایە چیە بـراژن؟

براژنیشـم لەگـەڵ منداڵەکانـی هاتنـە حەوشـەو گوێیـان هەڵخسـت و چونـە بـەردەم قاپـی حەوشـە، بینیـان خـەڵك لـە هەمـوو لاوە بـەرەو کۆڵانـی تەنیشـتیان بـە نەرمـە لۆقـە ڕادەکەن، لـە گەنجێکی پرسـی: ڕۆڵـە ئـەوە چـی بـوە؟ گەنجەکەش گوتـی: دەڵێـن کوڕێکی مـام کاکەشـین خـۆی کوشـتووە.

هەمدیسان ئەو پرسیارەم لە خۆم کردەوە: ئەرێ بۆچی مرۆڤ ڕێگای ڕاستی پێنادۆزرێتەوە و پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات؟ براژنیشم گوتی ئەیەڕۆ دەبێ بۆچی کوڕی مام کاکەشین خۆی کوشتبێت؟ دەبێ کامیان بێت؟ دیاربوو براژنم ماڵەکەی دەناسی.

هەمووومان بە هەڵەداوان بەرەو ماڵی مام کاکەشین کەوتینە ڕێ، حەشاماتێکی زۆر لەناو حەوشە و بەردەمی ماڵیان کۆ ببونەوە، دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار پێکەوە قسەیان دەکرد و لە هۆکاری خۆکوشتنەکە دەدوان، ئەوەی خۆی کوشتبوو خوێندکاری دوانزەی زانستی بوو، دوای لێکۆڵینەوەی دادوەر و لێکۆڵەر و ئەفسەرانی پۆلیس دەرکەوت خۆکوژەکە حەزی بە خوێندن نەبوە، بەڵام لەلایەن باوك و برایەکیەوە زۆری بۆ هێنرابوو کە دەبێ لە خوێندن بەردەوام بێت و بشچێتە بەشی زانستی و نمرەی بەرزیش بەدەستبهێنێت، باوکی پێی گوتبوو : چیت لە کوڕی مام عوبێد کەمترە ئەو بوو بە دکتۆر و ئێستا عیادەی هەیە و بە حەوت پشتەوە پێی خەنی بوون، ئاخر چاوێکت لەو کەمترە، سەرت لەو بچوکترە، سەقەتی، قۆڕی؟

باوکی پێی دەڵێ: گەر نەبیت بە دکتۆر، نابێ بێیتەوە ئەم ماڵە.

سێیەم حاڵەتی خۆکوشتنم لە دەفتەری یاداشتەکانم دا زیاد کرد، بۆ هەر یەکێکیان چەند لاپەڕەیەکم کردەوە و ناوی سیانی و تەمەن و پیشە و ناونیشان و هۆکاری خۆکوشتنەکانم تۆمار کرد، ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم، دیمەنی خوێن ڕژانی دوکاندارەکە و خۆهەڵواسینی خوێندکارەکە بە پەتێکی ئەستور لەبەر چاوم لانەدەچوون.

پێم وابوو ئیتر دەبێ هەوڵی خۆم چڕ بکەمەوە لەسەر دۆزینەوە و دەستنیشان کردنی پاڵنەر و هۆکارەکانی خۆکوشتن، ناکرێت هەمووومان بێدەنگ و بێ هەڵوێست بین، هەموومان بەرپرسیارێتیمان لەسەر شانە، تا هەوڵی جوان کردنی ژیان بدەین تاکو خەڵك بیەوێ بژیت، نەك بیەوێت بمرێت، پێویستە لە ئاست ئەم بەرپرسیارێتیە بین. دەمەدەمی عەسری ڕۆژی دواتر بەدەم ڕێگاوە بۆ پارکی شار و پشودانێك خۆم دەدواند و وامبەخۆم گوت.

لەسەر کورسیەك دانیشتبووم دەمویست دوور لە هەواڵی ناخۆش و بگرەو بەردەکانی شار، دوور لە هەواڵی خۆکوشتن پشوویەك بە ڕۆح و جەستەم بدەم، بەدەم زەردەخەنەوە چاوم بڕیبووە جوڵەی ماسیە ڕەنگاوڕەنگەکانی ناو حەوزێکی پڕ لە ئاوی ڕۆشن، ماسیەکان لە جووڵەی بەردەوام دا بوون، خۆیان لە قەدی یەکتردا دەسواند، دەچوونە ژێر حەوزەکە و لە پڕێك دا دەهاتنەوە سەر ئاوەکە، دەمیان دادەخست، کەمێکی پێدەچوو دەمیان دەکردەوە، گەمەیان دەکرد، کلکیان بادەدا و دەهاتن و دەچوون، لەخۆمم پرسی : دەبێ ماسیەکانیش وەك مرۆڤ بیر بکەنەوە و یەکتریان خۆش بوێ و ڕقیشیان لە یەکتر ببێتەوە؟ ئایا بەشەڕدێن و یەکتر دەکوژن؟ ئایا درۆ لەگەڵ یەکتر دەکەن و یەکتر هەڵدەخەڵەتێنن؟ ئایا ئەوانیش چاوبرسی و بە تەماعن؟ دەبێ ماسیش خۆی بکوژێت؟ ڕێگا و کەرەستەکانی خۆکوشتنی ماسی چین؟ بەدەم خۆدواندنەوە مۆبایلەکەم دەرهێنا و پشتم لە ماسیەکان کرد و چوومە ناو لاپەڕەکانی فەیسبوکەکەم، هەر لە یەکەم چرکەدا ماڵپەڕەکان هەواڵێکی دڵتەزێنیان بڵاوکردبووەوە : هەر ئێستا لە شاری هەولێر کچێکی تەمەن

نۆزدە ساڵ بە دەمانچەکەی باوکی کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا.

بە غەمناکیەوە تەواوی هەواڵەکەم خوێندەوە و لەدڵی خۆم دا گوتم: ناکرێ ئەم خۆکوشتنانە بە ئاسایی وەرگرین، دەبێ وردتر لە هۆکارە کۆمەڵایەتی و کەلتوری و پەروەردەیی و ژینگەییەکانی بکۆڵینەوە، نابێ نەزانین ئەم خەڵکە بۆچی پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات.

دەمویست یەکەم هەنگاو لە خۆکوشتنی توندڕەوێکی ئیسلامی بەندکراوەوە دەستپێبکەم و ڕیزبەندیەکیان بۆ دابنێم، بەپێی کاتی ڕووداوەکان و بارودۆخ و ژینگەی خێزانییان قسەی لەسەر بکەم، بەڵام تا دەهات ڕووداوی خۆکوشتنەکان زیادیان دەکرد و منیش سارد دەبوومەوە لە بەدواداچوون، چوونکە حاڵەتەکان لەیەك و دوو ترازان.

هەرچۆنێك بێت، لای من بابەتی خۆکوشتن بابەتێکی گرنگ بوو و پێویستی بە بە دواداچوونی زانستیی و لێکۆڵینەوەی ورد هەبوو، ناکرێ کەس خەم لەم بابەتە نەخوات و قسەی جددی لەسەر نەبێ.

یەکەم وێستگەی گەشتەکانم لە دوای هەولێرەوە بۆ شاری سلێمانی بوو، بەدەم ڕێگاوە بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی مرۆڤ بێ ئومێد دەبێت لە ژیان؟ دەبێت هۆکارەکانی بێ ئومێدی بدۆزینەوە و چارەسەریشی بۆ دابنێین، بۆ ئەمەش پێویستمان بە توێژەری کۆمەڵایەتی و دەروونناسی دەبێت، دوای گەیشتنیشم بە ماڵی هاورێکەم لە سلێمانی هەر بیرم لای پرۆژەیەکی هەمەلایەنە بوو کە ڕێگا چارەی دەرباز بوونی مرۆڤ لەخۆ بگرێ لە تەونی

کیشـە و گرفتەکانـی، بـۆ ئەمـەش دەبـوو پشـتیوانی حکومـەت و ڕێکخـراوە مەدەنیـەکان بەدەسـتبهێنم. دانـی ئێـوارەی ڕۆژی دواتر لەگـەڵ هاوڕێکـەم بـەدەم ڕێگاوە کـە دەچووین بۆ پێشـانگای کڕین و فرۆشـتنی ئۆتۆمبیـل، ئـەم بابەتەم وەك پڕۆژەیەکی مرۆدۆسـتی بـاس کـرد، لـە پێشـانگایەك چایمـان بـۆ دانرابـوو، کۆمەڵێـك کڕیـار و فرۆشـیار قسـە و باسـیان لەسـەر نرخـی ئۆتۆمبیـل و بـەرزی و نزمـی دۆلار بـوو، هاوڕێکەشـم پێشـنیاری ئـەوەی بـۆ کـردم بابەتی خۆکوشـتن بکەمـە سـمینارێك بـۆ ئـەوەی پڕۆژەکەم لـە ڕێگەی ئەو سـمینارەوە بـگات بەهەمـوو ئەو کەسـانەی دەیانەوێ لـەو پڕۆژەیە هاوکاریـم بکـەن، هاوڕێکـەم پێـی گوتـم : پێـم باشـە بابەتێکـی تێروتەسـەل لەسـەر دەرکەوتـە خراپەکانـی خۆکوشـتن ئامـادە بکەیـت و لـە زۆربـەی پارێـزگا و قـەزا و ناحیەکانـی کوردسـتان و تەنانـەت لـە لادێکانیـش سـمیناری لەبـارەوە بکەیـت، دیسـانەوە بە دەنگـی ڕیزێـك تەقـە بێـدار بومـەوە، هەمووومـان بـەرەو شـوێنی تەقـەکان ڕامانکـرد، ئـەوەی بینیمـان کارەسـاتێکی تـری خۆکوشـتن بـوو، پیاوێـك لـە نزیـك ئۆتۆمبیلێـك لەسـەر تەنیشـت کەوتبـوو، چەنـد فیشـەکێکی کلاشـینکۆفی نابـوو بە سـینگی خۆیـەوە، یەکتا خوێـن لەبـەری دەڕۆیشـت، یەکێکیـان شـارەزا بوو دەسـتی خسـتە سـەر دڵـی، گوتـی ڕوحـی تیانەمـاوە، لێـم پرسـی: دەبـێ بـۆ خـۆی کوشـبێت؟ ئەویـش گوتـی مـن دەیناسـم، دەمێـك بـوو ئیفلاسـی کردبـوو ڕەنگـە هۆیەکـەی ئـەوە بووبـێ.

سـەیرە ئـێ خـۆ دەتوانـێ بـە تێپەڕبوونـی ڕۆژگار خـۆی بونیـات بنێتـەوە، بۆچـی خـۆی بکـوژێ، هـەر لەو چەنـد ڕۆژەی لە سلێمانی مامـەوە، هەواڵـی خۆسـوتاندنی ژنێکـم بیسـت کـە لـە ڕقـی پیاوەکـەی دەبەیـەك بەنزینـی بەخـۆی دا کردبـوو و ئاگـری لەخـۆی

بەردابوو، ئەویش لە نەخۆشخانە گیانی سپارد، ژنێکی تر خۆی دەرمانخوارد کرد و مرد.

هەر لەو چەند مانگەدا سەردانی چەندین شار و شارۆچکەم کرد، لەزۆربەیان حاڵەتی خۆکوشتنم بیست و بەدیکرد. لە کەلار پیاوێکی هەژار کە خاوەنی حەوت منداڵ بوو خۆی کوشت، لەجیاتی ئەوەی کۆششی زیاتری بکردایە و لەگەڵ ژیان بکەوتایەتە زۆرانبازی و سەرکەوتنی بەدەستبهێنایە، تا بەلایەنی کەم بۆ منداڵەکانی ببوایە بە نەوا، کەچی خۆی کوشت و بۆ هەتایە منداڵەکانی بێبەش کرد لە نازی باوکایەتی، بە هاوڕێکەمم گوت: خۆکوشتنی پیاوە هەژارەکە خۆشاردنەوە بووە لە بەرپرسیارێتی بەخێوکردنی منداڵەکانی یان ئاڵۆز بوونی بیرو هۆشی بەجۆرێك ڕێگەی خۆ دەرباز کردنی پێ نەدۆزرێتەوە؟

لە دەربەندیخان مێردمنداڵێك لەسەر خانوویەکی دوو نهۆمەوە خۆی فڕێدا و گیانی سپارد لەبەر ئەوەی کارێکی نەشیاوی کردبوو و لێی ئاشکرا ببوو، لە هەڵەبجە پیاوێك بە ژەهر خۆی کوشت، لەبەر ئەوەی بەرکەوتەی کیمیایی بوو و بەرگەی ئازارەکانی جەستە و ژیانی نەگرتبوو، بە دەستێکی لەرزۆکەوە نامەیەکی کورتی لەژێر بالیفەکەی جێهێشتبوو، بە دەستخەتێکی شەپرێو نوسیبووی: چارەسەرم لە دەرەوەی وڵات هەبوو، بەڵام کەس لە ئازارەکانم تێنەگەیشت و خەمیان لێنەخواردم.

لە قەزای دووکان و زاخۆ و کۆیە و شەقڵاوە و ڕانیە و بنەسەڵاوە و قەڵادزێ و سۆران و خەبات و حاجیاوە و شێخان و کفری چەندین حاڵەتی خۆ کوشتن ڕوویاندا کە هەر یەکێکیان بیانویەکیان بۆ

خۆیـان داتاشـیبوو، کچێـك خـۆی خنکانـد لەبـەر ئـەوەی نەدرابـوو بـە گەنجێـك، کچێکـی تـر خـۆی سـوتاند لەبـەر ئـەوەی هەڕەشـەی بڵاوکردنـەوەی وێنـە ڕووتەکانـی لێکرابـوو، کوڕێکـی تـر لەبەر ئەوە خـۆی کوشـت، نەیتوانیبـوو نمـرەی پێویسـت بەدەسـت بهێنێـت لـە پۆلـی دوازدەی ئامادەیـی، ژنێـك خـۆی سـوتاند، لەبـەر ئـەوەی پیاوەکـەی خیانەتـی لێکردبـوو، هەرزەکارێـك خـۆی دایـە بـەر چەقـۆ، لەبـەر ئـەوەی تیپـە دڵخوازەکـەی ئـەو دۆڕابـوو لـە یـاری مۆندیـال، کچێکـی تـر خۆی کوشـت لەبەر ئـەوەی باوکی بـە زۆر لە برازایەکـی خـۆی مـارەی کردبـوو.

لەنـاو تارمایـی ئـەم هەمـوو خۆکوشـتنانە دۆشـدامابووم، هـۆکاری زۆربـەی حاڵەتەکانـم بـۆ نزمـی ئاسـتی وشـیاری کۆمەڵگـە و خۆدزینـەوەی حکومـەت لەژیـان و پـەروەردەی کۆمەڵایەتـی گەڕانـدەوە، لـە خـوارەوەی ئـەو دەفتـەرەی کـە نـاوی سـیانی و ناونیشـانی ئەوانـەی خۆیـان کوشـتبوو نووسـیم: لەڕاسـتیدا هیـچ بیانویـەك ڕەوایەتـی بـە خۆکوشـتن نـادات و دامـەزراوە مەدەنییـەکان کەمترخەمـن لـە وشـیارکردنەوەی کۆمەڵگـە و دابین کردنـی ژیانێکـی شایسـتە بەڕەچاوکردنی جۆرێك لـە دادپەروەری، گـەر دامەزراوەکان وشـیار بن، خەڵکیش وشـیار و بێـدار دەبێتەوە، ئەوسـا هانـا بـۆ خۆکوشـتن نابـەن.

(٤)

گەر لە دورەوە بڕوانیتە دیمەنی ئەم گرتوخانەیەی تۆ تیای بەندی، وەك قەڵایەكی گەورەی سەردەمی زوت دێتە بەرچاو، چوونكە لە هەر چوار لاوە بە دیواری پان و بەرز دەورە دراوە، جگە لە دەرگایەكی گەورەی پۆڵاین لە هیچ شوێنێكی ترەوە ڕێگەی چونە ژورەوە و پێدا هەڵگژانی نیە. لەهەر چوار سوچی گرتوخانەكە خاڵی پاسەوانیان بۆ دروست كردوە و نێوان هەر خاڵێك بۆ ئەوی تر تەلبەند كراوە بە جۆرێك هیچ بوارێك نەبێت بۆ هاتوچۆی ئۆتۆمبیل و پیادە. دوو سەد هەنگاوێك دوور لە دەرگا پۆڵاینە سەرەكیەكە خاڵێكی پشكنین دانراوە، بۆ پشكنینی ئەوانەی سەردانی بەندیخانەكە دەكەن، لەوێ گەر ڕەزامەندیی چوونە ژوورەوەت پێ درا، كارتێكی مۆڵەتت پێدەدەن بۆ پرسگەی یەكەمی بەندیخانەكە، لە پرسگەی ناوەوەش دووبارە لەشت دەپشكنن و لەچەكی بچوك و چەقۆ و ژەهر و حەپ و شروبی بێهۆشكەر و كەرەستەی تری زیانبەخش خاڵیت دەكەنەوە.

شەممەی ڕابردوو كارمەندەكان یەك یەك ژووری بەندكراوەكانیان خاوێن كردەوە و سەرو جلی خەو و كەلووپەلی تراش و خاولی و سەرچەفی نوێیان دایە بەندیەكان و تراش كردن و خۆشۆرینیان فەرز كرد، جۆری چێشتەكانیشیان گۆڕی و لە هەفتەیەك دا ژەمێك گۆشتیان زیاد كرد، تەنانەت بەرپرسی هۆبەی بەندیەكان هەڕەشەی لەوانەش كرد كە سەرپێچی لە ڕێنماییەكان دەكەن،

چونکە هەندێك لە بەندییە ئیسلامیە توندڕەوەکان، بەتایبەتی هاوڕێکانی ئێوە نەیاندەویست ڕدێنیان بتراشن و بە کوفرێکی گەورەیان دەزانی، بەندیەکان هۆکاری ئەم هەموو خزمەت و گۆڕانکاریانەیان نەدەزانی و وەك مەتەڵ وابوو بۆیان.

نە کودەتا ڕویدابوو، نە سیستەمی سیاسی وڵات گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو، ئەی ئەم گۆڕانکاریانە چین؟ نەیاندەزانی .

لە گەراجی بەندیخانەکەوە بە جادە قیرە شەقار شەقارەکەدا هۆرتەهۆرت بەرەو پرسگەی یەکەم دەڕۆیشتین، من لە پێشەوە و یاسینی چایچی براشت لەدواوە لەسەرخۆ ڕێمان دەکرد.

یاسین بەدەم ڕۆیشتنەوە لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد: خەمت نەبێ بەڕێوەبەری بەندیخانەکە خزممە و ئاسانکاریمان بۆ دەکات، تا براکەی من و بەندیەکانی تر ببینی و بیاندوێنی.

لێپرسراو و کارمەندانی پرسگەکان یاسینیان دەناسی و دەیانزانی تۆ برای ئەوی و بە تۆمەتی تاوان کردن و تێکەڵ بوون بە گروپە ئیسلامیە تەکفیریەکانەوە گیراوی، لە سەرەتای ڕووداوەکاندا ڕقیان لەویش دەبوەوە و هیچ ئاسانکاریان بۆ نەدەکرد کە دەیویست بتبینێت، بەڵام هێواش هێواش لەوە تێگەیشتن یاسینی چایچی دوورە لەتێگەیشت و بیروباوەڕی تۆوە، جگە لەمەش خزمایەتیتان لەگەڵ بەڕێوەبەری بەندیخانە هۆکار بوو بۆ هاوکاری کردنم لەم سەردانی کردنەم، ئیدی یاسین لەگەڵ کارمەندان ببوون بە برادەر و لە کاتی هاتنی، گەر ڕۆژی سەردانیش نەبوایە هاوکاریان دەکرد، دوێنێش هەر لەدوورەوە کارمەندێکی پرسگەی سێیەم بە پێکەنین و سوعبەت کردنەوە

گوتی: بۆنی چایەی عتورت لێدێت یاسین، یاخوا بەخێر بێی میوانی هەمیشەیی.

من و یاسین وەك كارمەندەكە پێكەنین و سڵاومان كرد، هەر ئەو كارمەندە بە پێكەنینەوە گوتی:

بەڵام ئەمڕۆ مۆڵەتی چونە ژوورەوەت نادەین بەداخەوە.

یاسین وایزانی گاڵتەی لەگەڵ دەكات، تەوقەی لەگەڵ هەموو كارمەندەكان كرد و ڕوەو ژوورەوە ڕۆیشت, كارمەندەكە دووبارە پێی گوتەوە :

-بەڵام ئەمڕۆ ناتوانین ڕێی چونە ژوورەوەتان بدەین .

-ئاخر بۆ ؟

-چوونكە جەنابی وەزیر سەردانی ناو بەندیخانە دەكات و بەشەكان و بەندیەكان بەسەر دەكاتەوە و لە كەموكووڕیەكان دەپێچێتەوە.

گرتنەبەری ڕێكاری پێویست بۆ بینین و دواندنی بەندیەكی ئیسلامی توندڕەوی وەك تۆ هەروا ئاسان نەبو ئەگەر، یاسینی برات لە ڕێگەی بەڕێوەبەری بەندیخانەكەوە ئەم دیدارە سێ ڕۆژیەی ڕێكنەخستایە بەتایبەتی بۆ منێكی دوورە وڵات كە تازە گەڕابومەوە و هیچ كام لە كارمەندانی بەندیخانەكەم نەدەناسی، بەتایبەتیش گەر بمویستبا بەندیەكان بدوێنێم و ڕووداوی خۆ كوشتنی بەندیەكم بۆ بگێڕیتەوەو كتێبێكتان لەبارەوە بنوسم.

ڕۆژی دواتر ئەم ژوورە بچووكەیان بۆ تەرخان كردم و مەرج و

ڕێنمایی و ڕێوشوێنی پێویستیان پێگوتین.

ئێستا بۆم هەیە تەنها دوای نیوەڕۆیان کە دەوامی ئاسایی نامینێ لەم ژوورەی تیاین، بتبینم و بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك قسەت لەگەڵ بکەم، ئیدی ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژمە لەگەڵت دابنیشم و گوێ لەچیرۆکەکانی ژیانت بگرم و بزانم بۆچی و لەسەر چی گیراوی و بەندیەکەی هاوڕێت بۆچی پەنای بۆ خۆکوشتن برد؟

دەمەوێت لەسەرەتاوە بپرسم: لەسەر چ تاوانێك گیراوی؟

مامۆستا هیوا بەو پرسیارەی، کۆتایی بەقسەکانی هێنا و فەرمووی لێکردم من قسە بکەم. ئێستا من لەبەرانبەر ئەو لەژوورێکی تەرخانکراوی بەندیخانەکە دانیشتوم، وەك تەواوی بەندیەکانی تر بەزۆر تراشم پێکراوە بۆ ئەوەی هەمووومان لەبەر چاوی وەزیر وا دەربکەوین کە هیچ کێشەیەکمان نیەو هەموو مافێکمان بۆ دابین کراوە و ڕوخسارمان ڕوونە، لە ناسنامە ناوم سەودا عەزیز جەبارە، بەڵام هەر لە منداڵیەوە دایك و باوکم بە ئیبراهیم بانگیان کردووم، برای یاسینی چایچیم و شەش حەوت ساڵێك لەو بچووکترم، لەناو گروپەکەمان بە ئەبو جەعفەر مەنسور بانگ دەکرام، خزمەکانیش پێیان دەگوتم برایم و برادەرەکانیشم ناوەکەمیان بۆ ( بلە ) کورت کردبووەوە، دوو کوڕی سێ ساڵە و پێنج ساڵەم هەیە، ئەمیری گروپەکەمان ناوی کوڕە بچووکەکەمی لە شاخەوانەوە پێ گۆڕیم بە جەعفەر بەناوی ئەبو جەعفەری مەنسور، دەمەوێت ڕاشکاو و ڕاستگۆ بم لەگەڵت دا، دانی پیادەنێم لەسەرەتای گەنجیم سەرسەری و شەللاتی و ئارەق خۆر بووم بەڵام دواتر خەونێك سەرتاپای بیرکردنەوە و تێڕوانین و تەنانەت ڕوخساریشی گۆڕیم.

مامۆستا هیوا کە بەزمانی یاسینی برام بە ئەفەندی ناوی دەبرا، لە بەرانبەرم دانیشتوە و بە مۆبایلەکەی گێڕانەوەکانم تۆمار دەکات، ئەو چرکەیە لە کاتی قسەکردن پەنجەکانی دەستم دەتەقاند کە جۆرێك بوو لەشەرم کردن، هێواش هێواش لە نوکەوە چی ڕاستی بوو بۆم درکاند.

تاکو تەمەنی نۆزدە ساڵی کەسێکی باش نەبوم، بەو پێیەی هاوڕێیەتی گەنجی لاسار و بەدخوم دەکرد، لەوانەوە فێرە مەی خواردنەوە بوم و نوێژم تەرك کرد، من وا تێگەیشتبووم مردن نیە بەڵام، شەوێك خەونێکم بینی، بەو خەونە خوای گەورە بەهۆشی هێنامەوەو لە چەوتی و لاری و خواری و وێڵی گێڕامیەوەو شاڕێگەی ئاینی پێ نیشاندام.

بێئەوەی مامۆستا هیوا داوای گێڕانەوەی خەونەکەم لێبکات دەستم کرد بە گێڕانەوەی.

-مرۆ هەمیشە خۆی بەگەورەتر دەبینێ لەئاست سروشت، تا ئەو کاتەی توشی بەڵایەکی گەورە دەبێ، ئەوسا دەزانێ چەند بچووکە لەئاست ڕووداوەکان، تا ئەو کاتەی خەونەکەم بینی بوو وا تێدەگەیشتم گەورەتر و بەهێزترم لەو ڕووداوانەی سروشت کە لەلایەن خوداوە ئاراستەی زەوی و مرۆڤایەتی دەکرێ، پێم وابوو دەتوانم ڕووبەڕویان ببمەوە و بەسەریاندا زاڵ بم، دەتوانم تەمەنی خۆم درێژ بکەم و تەندروستیم لە خەڵك « لە دەوروبەرم باشتر بێ، تووشی نەخۆشی و سەرئێشەکانی ژیان نابم، دەتوانم هەورازە سەختەکانی ژیان ببڕم و ئەو کۆسپانە تەخت بکەم کە دێنە ڕێگام، پێم وابوو لە خەڵك جوانترو نازدارترم، ئەوەی بۆ خەڵك ناشێ بۆ من دەشێ، تا هەتایە بە

گەنجی دەمێنمەوە، بەڵام وا نەبوو مرۆڤ زۆر بچووکە بەراورد بە خودا و سروشت.

کاتێك مامۆستا هیوا لەزاری خۆمەوە چیرۆکەکانمی بیست، لەوە تێگەیشت کە ناتوانێ تەنها لەسەر پرسی خۆکوشتنی بەندییەك قسەم لەگەڵ بکات، بەڵکو سامناکی چیرۆکەکانم ناچاریان کرد گرنگی بە یاداشت کردنی ژیانی منیش بدات، بۆیە لە دەفتەرەکەی بەردەستی نووسی: بۆ ئەوەی بزانین بۆچی بەندکراوەکەی بەندیخانەی هەولێر خۆی کوشت دەبێ لە چیرۆك و بەسەرهاتەکانی ئیبراهیمی هاوڕێیەوە دەستپێبکەین.

پشتی گردە مشکە شوێنی دانیشتن و خواردنەوەی پێشترمان بوو، عەسرانێکی ئەو پایزە بەپێ بەرەو شوێنەکە بەڕێکەوتم، لە خەیاڵی خۆم دا ئەو دەشتە پان و بەرینەی بەردەم گردە مشکە ببوە شاخ و داخ و تەپۆلکەی بەرزو نزم، لە خەیاڵی من دا هەر دۆڵێك و نێوان هەر دوو تیشە شاخێك ڕووبارێك ئاوی پێدا دەهات ڕەوو هەولێرو پێدەشتە برینگەکانی ئاو دەدا، گردە مشکەم لێ ببوو بە تاڤگە و زۆر لام دڵگیرو جوان بوو، هی ئەوە بوو لەوێ لەو تاڤگەیە بەدەم خواردنەوەوە کەیف و سەفاو شادی خۆم دەرببڕم، تاڤگەکە یەك پارچە فریزی سروشتی بوو، بەرینی ڕووبارەکە هەر دە دوانزە مەترێك و قوڵیەکەشی نیو مەتر کەمتر دەبوو تا ئەژنۆ دەهات، هەر پێم خۆشبوو لەو گەرمای پایزەدا بەناو ڕووبارەکەدا بڕۆم و خۆم فێنك بکەمەوە.

تازە گەیشتبومە تەپۆلکە خەیاڵییەکانی خۆم، وەختێ گوێم لەگرمەیەکی بەهێز بوو لە شێوەی گرمەی هەوری سەرەتای مانگی نیسان، دەنگە بەهێزەکە ڕایچەڵەکاندم، بەڵام

نەیوەستاندم لە ڕۆیشتن و گەیشتن بە گردە مشکە، بیرم لای خوانەکە بوو کە ئێستا هاوڕێکانم لەوێ خەریکی ڕازاندنەوەین، بە دڵخۆشی خێرا خێرا هەنگاوم دەنا تا زوتر بگەمە لای هاوڕێکانم و دەستبکەین بە خواردنەوە.

-هاکا دەگەم .

لە هەنگاونانم دا گرمەیەکی تری بەهێز تۆز و تەرانی بەرز کردەوەو زەوی بەتوندی لەرزی، بەو دەنگە بەهێزە بەشێك لە گردۆلکەکانی نزیکم داڕمان، هێواش هێواش با هەڵیکردو تەپوتۆزی لەگەڵ خۆی هێنا، باکە تا دەهات بەهێزتر دەبو و ڕووخساری ئاسمانی لە شینێکی کاڵەوە گۆڕی بۆ مەیلەو سور، ئیدی باکە خێراتر هەڵی کرد، لە کزە باوە گۆڕا بۆ بایەکی زۆر بەهێز، بەجۆرێك دار و دەوەن بەسەر یەکتردا بشکێنێت و درەختە گەورەکانیش بەسەریەك دا بخات و بەلادا بکەون، لە دوورەوە ڕوانیمە ناو شار، لەبەرچاوم خانو و باڵەخانەکان دادەڕمان و دەکەوتنە سەر زەوی و گردو تەپۆلکەکانی دەوروبەری بۆ ناخی زەوی شۆڕ دەبوونەوەو نقوم دەبوون.

ڕەنگی ئاسمان بە تەواوی گۆڕا بۆ سوورێکی تۆخ، ترسێکی زۆرم لێنیشت، لەشم کەوتە لەرزین، ئیدی واتێگەیشتم ژیانی سەر زەوی بەرەو کۆتایی دەڕوات، ڕووی خۆم وەرگێڕا بەرەو ناو شار هەنگاوم نا تا فریای منداڵەکانم بکەوم، دڵم خێرا خێرا لێی دەدا و ئەژنۆکانم هێزیان لەبەر نەما و نەمدەتوانی بە باشی هەنگاو بنێم، هێواش هێواش هەناسەم تەنگ دەبو و هەوا پاکژی خۆی لە دەست دا ئەوەی هەڵمدەمژی نیوەی تۆز و خۆڵ بوو، جارێکی تر زەوی بە توندی لەرزی، بومەلەزەکە بوە هۆی داڕمانی خانو و

باڵەخانەکان، چەند جارێکی تریش بەدوای یەك دا زەوی لەریەوە، با بەهێزەکە کەلووپەل و دار و دەوەنی لەگەڵ خۆی دەهێنا و دەیخستم و دەیدام بەزەویدا و هەڵدەستامەوە، بەلادا دەهاتم و دەکەوتم، جارێکی تر هەڵدەستامەوە سەر پێ و هەنگاوم دەنا، دیسان دەکەوتمەوە و دیسان هەڵدەستامەوە.

تۆز و باکە هەناسەی تەنگ کردبووم بە شێوەیەك کە خەریك بوو بخنکێم، دەمویست بە دوو قەڵەمباز بگەمەوە ناو شار، تا حاڵی خەڵك و منداڵ و خزم و کەسوکارم ببینم و فریای منداڵەکانم بکەوم بەڵام لاقەکانم توانای هاوێشتنی شەقاوی گەورەیان نەمابوو « بگرە هەندێك جار وا هەستم دەکرد هەنگاوەکانم بۆ دواوەیە نەك بۆ پێشەوە، ترس هەمووگیانی تەنیبومەوە سەرتاپای لەشم کەوتە لەرزین، نمنم باران دەستی پێکرد، بە چەند چرکەیەك بارانەکە بوە ڕەهێڵ، ئەوەی لام ترسناك بوو دڵۆپە بارانەکە هێندە گەورە بوو کە هەرگیز لە ژیانی خۆم دا بارانی وام نەبینیبوو، جگە لەوەش ڕەنگی دڵۆپە بارانەکە سوور بو و لەسەر زەوی لەخوێن دەچوو کە لە شوێنە چاڵەکان پەنگی خواردبوەوە، چەخماخەی هەورە تریشقە و بروسکەکەی هێندە خێرا و بەهێز بوو، مێرم دەویست نەترسێ و لەبەری خۆی ڕاگرێ.

لەهەموو لایەکەوە زەوی دادەقڵیشا چاڵ و کەلێنی گەورە گەورە لە زەوی دروست بوو، لەناکاو تۆپەڵە ئاگری گەورە لە شێوەی بۆمبا بەر زەوی کەوت، تۆپەڵێك ئاگر وەك تۆپی دوورهاوێژ لەبەردەمم دا تەقیەوە و پێم وابوو جەستەم هەپرون بە هەپرون بوە، هەرواش بوو کەللە سەرم لە لاشەم

جیابویەوە، بیرمە کەللە سەرم لەگەڵ جەستەی پڕ برینم دا کەوتنە قسە، ئەو خەتای ئەم و ئەمیش خەتای ئەوی دەگرت لە توشبوون بەم چارەنووسە، جەستەی بریندارم هەنگاوی نا بەرەو لای کەللە سەرم، خوێن لەجەستەم دادەچۆڕا، دڵۆپێك خوێنی گەش کەوتە سەر کەللە سەرم، لەگەڵ چەخماخەیەك دا جەستە و کەللە سەرم ئاشتبوونەوە و بونەوە بەیەك.

بیرم بۆ ئەوە چوو کەئیتر ئێستا زەوی بەتەواوی لەناو دەچێ و مرۆڤایەتی کۆتایی دێ، ئەوەی بەچاوی خۆمم بینی هەر ئەوە بوو کە لە مەلاکانم بیستبوو ڕۆژی دوایی بەنەفخی سوور دەست پێدەکات و خودا کۆتایی بەژیانی مرۆڤایەتی دەهێنێ، بەرەو ناو شار هەنگاوم نا، لەناکاو دەنگێك بانگی کردم گوتی: لە شوێنی خۆت بوەستە و مەڕۆ و گوێ لە ئامۆژگاریەکانم بگرە، ئیتر دنیای ڕۆشن کۆتایی هات، کاتی تۆبە کردن و شەهادە هێنانە، لە شوێنی خۆم داچەقیم و ئەژنۆکانم توانای ڕاگرتنی جەستەمی نەما و بەدەما کەوتم، لەسەر ئەژنۆ ڕووم سوڕاند بۆ لای قیبلە و گوتم : ئەی منداڵەکانم ؟

دەنگەکە بە میهرەبانیەوە گوتی : خودا خاوەنی ئەوانە نەك تۆ .

هەناسەم بەتەواوی وەستا، خەریك بوو بخنکێم، ئەوەندەم لە بیرە کە شەهادەم هێنا و تۆبەم کرد.

کاتێ لە خەو ڕاچەڵەکیم دەستی سارام بینی قۆڵی ڕادەتەکاندم، چەند جارێك پێی گوتم :

-برایم...... برایم ئەوە چیتە بۆ هاوار دەکەی ؟

ڕاست بومەوە و دیسان شەهادەم هێنا، هەموو گیانم شەڵاڵی ئارەقە بوو، دەست و لاقم دەلەرزین: ئۆخەیش خوایە ئەمە خەون بوو نەك ڕاستی. (دوای بێداربونەوە وامگوت) .

ئیتر لەو چرکەیەوە بڕیارمدا هەرگیز هاوڕێیەتی کەسانی خراپ نەکەم و خۆم بەدوور بگرم لە خراپە کردن و هەر کارێك کە خودا پێیخۆش نەبێ، بەرەبەیان دەستێك جلی پاکم بردە ناو حەمام، هەرچی پیسی ئەقڵ و جەستەم هەبوو بە ئاوی پاك دامشۆری و خۆم خاڵی کردەوە لە دەبەنگی، لەو ڕۆژەوە هەوڵم داوە لەجێی ئەتواری ناشیرین و قێزەون، لە جێی ڕفتار و خوی خراپ، لە جێی پیسی و بۆگەنی، لە جیاتی سەرەڕۆیی و بەرەڵایی، کاری باش « ڕفتاری باش و ویژدانی زیندوو بچێنم، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە دوای کاروباری ڕۆژانە دەچومە مزگەوت و خواپەرستیم دەکرد.

زۆر جار لەناو مزگەوت ئەو خەونە ناخۆش و ترسهێنەرەم دەخستەوە بیرم، خەونەکەم وەك فیلمێك دووبارە تەماشام دەکردەوە و زەینم دەدایە کارەساتەکانی ناوی، وەك ئەو فیلمە دەهاتە بەرچاوم کە هۆلیوّد کۆتایی جیهانی ڕاگەیاند، بەوە جارێکی تر تۆبەم دەکرد و داوای بوردنم لە خودا دەکرد لەو هەڵانەی لە ڕابردوو دا کردبووم.

بە درێژایی ئەو ماوەیەی هاموشۆی مزگەوتم دەکرد دڵم ئاسودە بوو، مزگەوت دڵنیایی و دڵخۆشی پێبەخشیم، وام هەست دەکرد مرۆڤێکی ترم، نەك ئەوەی جاران، دەستکەوتێکی گەورەم بەدەست هێناوە، کەسوکاریشم ئەو هەنگاوەیان بە هەنگاوێکی گرنگ و گەڕانەوە بۆ لای خوا وەسف دەکرد و دەستخۆشیان لێ

دەکردم و هانیان دەدام بەردەوام بم.

هەڵخلیسکان و هەڵدێرانی من لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد لە مزگەوت چەندین کەسی نوێ بوونە ئاشنام کە پێشتر نەمناسیبوون، بەتێپەڕ بوونی کات بۆم بوون بە هاوڕێی گیانی بەگیانی، زۆر جار پێکەوە گفتوگۆمان لەسەر دەق و سونەت و فەرزەکان و چۆنیەتی نوێژکردن و ڕۆژو گرتن دەکرد، لەناو ئەو کەسە نوێیانە کوڕێك بەناوی ئیسماعیل ببوە هاوڕێم، زۆربەی ئەو کاتانەی دەستبەتاڵ و بێکار بووم پێکەوە دادەنیشتین، هێواش هێواش هاتوچۆی خێزانیشمان بۆ دروستبوو.

ئێستا دوای نزیکەی چوار ساڵ خۆم وەك ئەو ماسیە دێتە بەرچاوم کە دەبێ بەتۆڕی ڕاوچیەکەوە، ئیسماعیلیش بوو بە ڕاوچیەکە، ئەو دەرچووی پەیمانگای ئیسلامی بوو، شارەزایەکی باشی شەرع و بنەماکانی ئاین و مێژووی ئیسلام بوو، کاریگەری زۆری خستە سەرم تا بەو شێوەیەی خۆی دەیزانی و دەیویست وا خواناسی بکەم، ڕیشێکی درێژی هێشتبوەوە و ڕیش هێشتنەوە و داپۆشینی باڵا و دەموچاوی مێینەی بە فەرز دەزانی و دەقی دەکردە بەڵگە بۆ قسەو بۆچونەکانی، گۆشتی دەستی هەموو سەربڕێکی نەدەخوارد، دەیگوت : سەربڕەکان ئیسلام نین، نوێژی لەدوای هیچ مەلایەکەوە نەدەکرد و هەموانی بە جاهیل ناودەبرد، بەر لەوەی مەلا بانگ بدات لە مزگەوتەکە دەڕۆیشت بۆ ئەوەی نوێژ لەدوای مەلاوە نەکات، ئیدی هێواش هێواش کەوتمە ژێر کاریگەریی تێڕوانینەکانی ئیسماعیل، منیش سارام ناچار کرد، جگە لە خۆم کەسی تر دەموچاوی نەبینێ و سەرپۆشم سەپاند بەسەریدا.

دانی پیادەنێم کە پەیوەندی من و سارای خێزانم لەسەر سەپاندنی سەرپۆش ئاڵۆز بوو، لەبەر ئەوەی ئەو خاوەنی هەمان بیرکردنەوە و تێگەیشتنی من نەبوو بۆ خواناسی، دوای تێهەڵچوونی باوك و دایکی لە کێشەکەمان و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنیان پەیوەندیەکانمان ئاسایی ببوەوە، بەڵام هێشتا نەچوبوەوە قۆناغی پێش تێکەڵ بوونم بەم گروپە ئیسلامیە، بۆیە زۆربەی کات لەیەکتر دڕدۆنگ بووین، من شوێنپێی هاوڕێکانم هەڵگرتبوو، دەمویست هاوڕێیەتی هیچ کەسێك نەکات و لەگەڵ دەرو دراوسێ و خزمەکانی تێکەڵ نەبێ و هاموشۆی یەکتر نەکەن، ئیسماعیلی هاوڕێم دڵی پڕ کردبووم لە گومان، گومان لەسێبەریش، تەنانەت پێم خۆش نەبوو لەگەڵ برای خۆی و منیش دانیشێت و هەڵسوکەوت بکات.

لای من زۆربەی بەرکەوتنەکانی ژیان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان حەرام کرابو و گیرۆدەی ئەو بۆچونانە بووم کە ئیسماعیل هەیبوو، بە هێواشی بوومە خاوەنی هەمان تێگەیشتن، هاتوچۆی خزم و کەسوکارم کەم کردەوە و هەوڵمدەدا هیچ بەریەککەوتنێکمان نەمینێ لەگەڵ هاوسێ و کەسوکار و دۆست و هاوڕێکانی پێشترمان دا، چونکە پێمگوترابوو نابێ هاتوچۆی ئەوانە بکەی کە خاوەنی هەمان تێگەیشتنی ئێمە نین بۆ خوا ناسین.

ئیسماعیل لەسەرخۆ و بەشێنەیی بە کەسانی تریشی ناساندم و خستمیە ناو شانەیەکی ڕێکخستنە نهێنیەکانیانەوە کە ئەوان ناویان نابو گروپی مسوڵمانان، یەك لەوانەی پێیناساندم ئەبوو

حەنیفە بوو کە لەڕێکخراوە نهێنییەکەیان پلەیەکی باڵای هەبوو، هەر گروپێك لە پێنج کەس پێکدەهات، سەرەتا لەقۆناغی یەکەم دا نەدەبوو هیچ کام لەو پێنج کەسە یەکتر بناسن و داوای بینینی کەسی تر بکەن، ئەوسا لە هۆیەکەی تێنەگەیشتم، بەڵام دواتر زانیم مەبەستیان ئەوە بوو هەر مسوڵمانێکی ناو گروپ قۆناغی پێگەیین تێپەڕێنێ ئنجا مجاهیدەکانی تری ڕێکخراوەکەیان بناسێ و پەیوەندی و ئاشنایەتی دروست بکات لەگەڵیان دا، مەبەست لەمەش پاراستنی نهێنیەکانی گروپ و ڕێکخراوەکە بوو، تا هیچ زانیاریەك دزە نەکات و نەگات بە دەستی هێزە ئەمنیەکان.

ڕۆژانە لەگەڵ ئیسماعیل لە مزگەوت یان لە ماڵی ئەوان یان لە ماڵی ئەبوو حەنیفە دادەنیشتین و گفتوگۆمان لەسەر دەقەکان و لێکدانەوە جیاجیاکان و بارودۆخی سیاسی کوردستان دەکرد، لە سەرەتای یەکتر ناسینمان ئیسماعیل و ئەبوو حەنیفە زۆرترین قسەیان تەنها لەسەر شەرع و حەدیس و ئایەتەکان و ڕاقە جیاجیاکان دەکرد، تا ئەو کاتەی دڵنیا بوون کە توانیویانە ئەقڵ و ژیریم بەرەزەوت بکەن، دواتر زۆرترین قسەیان لەسەر حوکم و شێواز و بنەماکانی حکومڕانی و دەسەڵات گرتنە دەست دەکرد لە ڕێگەی جیهادەوە، دواجار خۆیان بە تاڵیبان دادەنا بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم و هەمان تێگەیشتنیان لای منیش کردە بنەمای کارکردن، جارێکیان لەئەبوو حەنیفەم پرسی: بۆچی حزبێك ڕانەگەیەنین و بچینە ناو کێبڕکێی هەڵبژاردنەوە؟ ئەویش لەسەرخۆ گوتی دیموکراتی هاوردەی ئەمریکا و جولەکەیە بۆ کۆمەڵگەی مسوڵمان نشین، تا ئاکار و هەڵسوکەوت و ڕفتاری مسوڵمانان بگۆڕن بەو چەشنەی

خۆیـان دەیانـەوێ و ئاینـی ئیسـلام لاواز بکـەن دواجـار دەوڵەتانی مسوڵمانئنشین داگیـر بکـەن و خێروبێـری بـۆ خۆیـان ببـەن.

پێمگـوت : کەواتـە هەڵبـژاردن کارێکـی ناشـەرعی و درۆی وڵاتـە ڕۆژئاواییەکانـە؟ گوتـی بەڵـێ تاغوتـەکان دەیانـەوێ ئاینی ئیسـلام لـە ڕێگـەی هەڵبژاردنـەوە لەنـاو ببـەن.

دواتر گوتی: گومانت نەبێ کە هەڵبژاردن درۆیەکی گەورەیە.

ئنجـا گوتـم : ئـەی خـەلیفەکانـی ڕاشـدین هەڵنەبژێـردراون لەلایـەن مسوڵمانانەوە؟

ئەویـش گوتـی : هێشـتا ئەقڵـی خـۆت پـاك نەکردۆتـەوە لـەو تێگەیشـتنەی نامسـوڵمانەکان بـۆ ئاینـی ئیسـلام و یاسـا و دەسـتورەکانی هەیانـە، پێویسـتە لـەوە تێبگـەی خـەلیفـەکان لەلایـەن مسـوڵمانانەوە بەیعەتیـان پـێ دراوە کـە خـودای گـەورە خسـتبویە دڵیـان تـا بەیعەتـی پێبـدەن.

هەرچەنـدە پێموابـوو بەیعـەت دانیـش جۆرێکـە لـە هەڵبـژاردن، بـەڵام زیاتـر ئینکاریـم نەکـرد، چوونکـە زۆر شـارەزا نەبـووم.

دوای خەونـە ترسـهێنەرەکە ملـم دابـوە کەسـابەت و بـە بڕێـك پارە لـە دوکانێـك شـاگرد بـووم، بـەو بـڕە پارەیـە کرێـی خانـووم دەدا و ژیانێکـی تـا ڕادەیـەك مامناوەنـدی بـۆ مـاڵ و منداڵەکـەم مەیسـەر کردبـوو، شـەوانیش لـە قوتابخانـە دەمخوێنـد بـەو هیوایـەی کـە خوێندنـم تـەواو کـرد دابمەزرێـم و ببـم بـە فەرمانبـەر، خـەون و ئاواتەکانـم لەسـەر بەدەسـتهێنانی بڕوانامـە هەڵچنیبـوو، بـەڵام ئەبـوو حەنیفـە ڕۆژێـك بانگـی کـردم و پێـی گوتـم : دەزانـی تـۆ

گوناهباری ؟

-گوناهەکانم چین تا لێیان دوور بکەومەوە؟

ئەمەم بە سەرسوڕمانەوە گوت.

گوتی: تۆ پارەی مانگانە لە کەسێك وەردەگری کە لەو فیرقانەن خودا بێبەشی کردون لە بەهەشت؟

پێشتر پێم وابو هەرکەسێك بڕوای تەواوی بە بونی خودا هەبێت و فەرزەکان جێبەجێ بکات مسوڵمانە، لەو ڕوانگەشەوە پەیوەندییەکانم ڕێکخستبوو لەگەڵ دەوروبەرم، بەڵام کاتێ تێکەڵی ئەم گروپە بوم دەبوو وەك ئەوان بیر بکەمەوە.

پێم گوت : بەڵام خاوەن کارەکەم خواپەرستێکی پاك دیارە.

ئەبوو حەنیفە گوتی: ئەوە تەنها لە چاوی تۆ وا دیارە کە خواپەرستە، دەبێ لێی دوور بکەویتەوە .

ناچار کرام واز لە دوکانەکە بهێنێم و لە کارگەیەکی دروست کردنی چپس جێیان بۆ کردمەوە بە هەمان مانگانەی پێشووم، کارگەکە لە دەرەوەی شار بوو، هەروەها تایبەت بوو بە خۆیان و کرێکارەکانیش لەوانە بوون کە تێکەڵی ئەو گروپە ببوون.

ئەو کاتەی مامۆستا هیوا گوێی لێم گرتبوو کە باسی کارگەی چپسم بۆ کرد خەیاڵی ڕۆیشت، خەیاڵی هەڵفڕی و چوە سەر ئەو ڕۆژانەی سەرەتای گەیشتنی بە ئەوروپا کە لەکارگەیەکی دروست کردنی چپس و شرینەمەنی کاری دەکرد و لەوێ ژنێکی خۆشویست. ئەم خەیاڵ و بیرکردنەوەیەی

لە دەفتەری یادەوەریەکانی تۆمار کردبوو، لەوێ نوسیبوی چۆن ژنێکی فەرەنسیم خۆشویست؟ ئەو دەیویست چیرۆکی خۆشەویستیەکەی بکات بە کتێبێك و فەنتازیا و حەقیقەتی ژیانی خۆی تیا ئاوێتە بکات، بەڵام کاتێك خۆی هەڵقورتاند لە خۆکوشتنی بەندیەکی ئیسلامی و دۆزینەوە و دواندنی منی حوکمدراو بیرۆکەیەکی تازەی هێنایە ئاراوە کە هەردوو ڕووداوەکە لە یەك کتێب دا بکاتە چیرۆکێکی سەربەخۆ، مامۆستا هیوا بۆیگێڕامەوە و گوتی:

دوو مانگی ڕەبەق دوای گەیشتنم بە فەرەنسا بێکار دەسوڕامەوە، بەڵام بەرێککەوت لە چێشتخانەیەکی پاریس کە نانی نیوەڕۆم لێی دەخوارد کوردێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانم ناسی بەناوی نەجیب، چێشتخانەکە خواردنی کۆمەڵگەی ( ڕۆژهەڵات )ی دروست دەکرد، یانی چێشتخانەکە تەنها خواردن و چێشتی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان هەبوو، لەوێ ئاشنایەتیەکمان بنیاتنا و ژمارە مۆبایلمان گۆڕیەوە.

لەو ماوەیە ژیانم بەبێ جوڵە و کار زۆر ناخۆش بوو، هەستم بە تەنیایی و نائارامی دەروونی دەکرد، بۆ خۆ ڕزگار کردن لەو دۆخە « بەشەرمەوە ڕۆژێك پەیوەندیم بەو ئاشنا ڕۆژهەڵاتیەوە کرد بۆ دۆزینەوەی کارێکی گونجاو بەجۆرێك هەم برێك خەرجیم دەستکەوێت هەم پێوەی بخافڵێم و لە دەسبەتاڵی ڕزگارم بکات، ئەویش لە کارگەیەکی دروستکردنی چپس کە خۆی تیایدا کاری دەکرد ڕەزامەندی بەڕێوەبەری کارگەکەی بۆ وەرگرتم تا سەردانیان بکەم.

کارگەکە زیاتر لە دووسەد کرێکار کاریان تیا دەکرد لە چەند

بەشێك پێكدەهات، من ڕەوانە كرام بۆ بەشی هونەری، ئەم بەشە بریتی بوو لە هۆڵێكی گەورە و ژووری سەرپەرشتیار و نوسینگەی كارگەكە و كۆگایەكی گەورەی هەڵگرتنی پەتاتە و ژووری ئامێری لەتكاری، سەرۆكی نوسینگەی كارگەكە گەنجێكی لێهاتو و دڵسۆز و گورج و گۆڵ دیار بوو بەناوی جێفری ئینگی، ڕۆژی یەكەم ( ئینگی ) بانگی كردمە ژوورەكەی خۆی، لێی پرسیم:

خەڵكی كوێی ؟ گوتم كوردستانی عێراق، گوتی بۆچی پەنات بۆ فەرەنسا هێناوە؟ گوتم چیرۆكی ژیانی ئێمەی كورد چیرۆكگەلی تراژیدین كە هۆكاری سەرەكیە لەوەی پەنا بۆ وڵاتانی ئەورووپی ببەین ڕەنگە لەئێستادا كات كەم بێت بۆ گێڕانەوەی.

ئینگی گوتی: من كارم بە چیرۆكی ژیانتانەوە نیە بەڵكو مەبەستمە لەوە تێبگەم بۆچی دەتەوێ لەم كارگەیە كار بكەی؟

ماوەی نەدام وەڵام بدەمەوە، هەر خۆی یەكسەر گوتی تۆو من و سەرجەم ئەفرادەكانی ئەم كارگەیە دەمانەوێت كارێك لە ئەستۆ بگرین لە بەرانبەردا بڕێك پارە بەدەستبهێنین و بۆ درێژەدان بە ژیانی خۆمان كەڵكی لێوەرگرین، پرسی وایە؟

گوتم : بێگومان وایە، ئنجا گوتی: ئەم كارگەیە هەندێك مەرجی داناوە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ لێرە كار بكەن و بڕێك پارەیان دەستبكەوێت، مەرجەكانیش لەم ئاگادارینامەیە تۆمار كراوە دەبێت بیخوێنیتەوە، دوای كاتژمێرێكی تر وەرەوە لام، گەر بەو مەرجانە ڕازی بیت دەتنێرمە بەشی گرێبەستەكان و لەوێ گرێبەستەكە ئیمزا بكە، گەر ڕازیش نەبی دەتوانی پاش

قاوه خواردنەوەیەك بڕۆیت، نەجیب قسەكانی ( ئینگی ) بۆ وەردەگێڕام، چونكە ئەوسا زمانی فەرەنسیم باش نەدەزانی.

ئاگادارینامەكەم بردە ژووری ڕێست كە كرێكارەكان لە كاتژمێرێكدا بەنۆرە هەر یەكێكیان دە دەقیقە تیای پشویان دەدا، ئاگادارینامەكە بە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی نوسرابوو هەر لەوێ نەجیب دەستی كرد بە وەرگێڕانی.

لەسەری سەرەوەی دەقەكە كە پڕ بوو لە مەرج و ڕێنمایی بۆ ئەوانەی داوای كاریان دەكرد بە خەتێكی درشت نوسرابوو: دەستپاكبە بۆ ئەوەی متمانەی ئێمە بەدەستبهێنی، دواتر نوسرابوو ڕاستگۆیی و دەستپاكی و دڵسۆزی بڕوانامەیەكی بەرزی تۆیە.

داواكاریانی بەڕێز : گەر بتانەوێ ڕەزامەندی ئیدارەی كارگە بەدەست بهێنێنن بۆ كار كردن، پێویستە ڕەزامەند و پابەند بن بەم ڕێنمایی و مەرجانەی خوارەوە.

نەجیب تەنها ئەو ڕێنمایی و مەرجانەی وەرگێڕا كە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بەمنەوە هەبوو، بۆ نموونە كاتەكانی كار كردن، شوێنی كاركردن، جۆری كارەكەم، بڕی موچەكەم، شێوازی مامەڵە و هاتنە ژورەوە و كات و شوێنی پشوم، پابەند بوون بە كاتەكانی دەوام و نان خواردن و زۆر ڕێنمایی و مەرجی تر .

دەبوو ڕەزامەند بم، چوونكە دەستبەتاڵ و گیرفان بەتاڵیش بووم، لە بیست دەقەی یەكەم ئاگادارینامەكەم بردەوە بۆ ئینگی، قاوەیەكی بۆ بانگ كردم، گوتی : ڕەزامەندی؟

گوتم: بەڵێ ڕەزامەندم.

ئینگی دەستی گرتم و بەرەو ژووری گرێبەستەکان بەڕێکەوتین، واژۆم لەسەر پەڕی گرێبەستەکە کرد کە لەقۆناغی یەکەم ماوەی شەش مانگ دیاری کرابوو، دوای شەش مانگەکە گەر هەردوولا لەیەکتر ڕازی بوون ئەوا بۆ جاری دووەم گرێبەستێکی نوێ واژۆ دەکرێ بەڵام ئەمجارەیان ماوەکەی یەك ساڵ بوو نەك شەش مانگ، هەموو بەشەکانی پێ بەسەر کردمەوە و بەدەم ڕۆیشتنەوە ئەرك و فەرمانی کرێکاران و فەرمانبەرانی بەشەکانی بۆ باسکردم.

ڕۆژی دواتر کاتژمێر هەشتی بەیانی بەجلی تایبەتەوە لە شوێنی دیاریکراو ئامادە بووم، ئەو شوێنەی من کارم تیای دەکرد هۆڵێکی گەورە بوو کە بەرێگەی قایشێکی کارەبابییەوە پەتاتەی دەهێنایە بەر دەستمان و ئێمەش دەبوو پەتاتەکە لە حەوزێکی ئاو بشۆینەوە، گەرد و تۆز و خۆڵی پێوە نەهێڵین و بیخەینەوە سەر قایشێکی تر کە بەشێوەی ئۆتۆماتیك دەیبردە ناو کارگەکەوە بۆ لادانی توێکڵەکەی و لەت لەت کردنی.

ئەو بەشەی ئێمە سەرپەرشتیارێك و چواردە کرێکار بووین، هەر یەکە و لە ڕەگەز و نەتەوەیەکی جیا بوو، نەجیب هەموویانی دەناسی، چوونکە چەند ساڵێك بوو بە دڵسۆزی لەو کارگەیە کاری کردبو و لە بەشی میکانیك کرابوو بە سەرپەرشتیار، منی بە هەموویان ناساند و وەسفی باشەی منی بۆ کردن، یەك لەوانەی کە لەو کارگەیە ئاشنایەتیم لەگەڵ پەیدا کرد کچە فەرەنسییەکە بوو، بەناوی سێمت دواتر ئاشنایەتیەکەمان پەلی هاویشت بۆ خۆشەویستی، دوای هەژدە مانگ لەگەڵ

سێمت ژیانی هاوسەریم پێکهێنا، بەڵام ماوەی هاوسەرێتیمان تەنها هەشت مانگی خایاند و لە یەکتر جیابوینەوە. مامۆستا هیوا هۆکاری جیابونەوەیان بۆ جیاوازی دابونەریت و کەلتوور و شێوەی بیرکردنەوە و تێڕوانینیان بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان گێڕابوەوە، لە دەفتەرەکەی دا نووسیبوی : وا باشترە پیاوی ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ کچانی ڕۆژهەڵاتی و پیاوانی ڕۆژئاوایی لەگەڵ کچانی ڕۆژئاوایی خێزان پێکەوە بنێن، چوونکە باشتر لەیەکتر تێدەگەن و زیاتر ئاوێتەی یەکتر دەبن و دابونەریت و بیرکردنەوەی یەکتریان پێ قبووڵ دەکرێت.

لە پاشنیوەڕۆی یەکەم دا مامۆستا هیوا دەیویست جار جار بیرەوەری و یاداشتەکانی خۆی ئاوێتەی گێڕانەوەکانی من بکات، لەمەش دا مەبەستی بوو ڕامبهێنێت لەسەر گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی گیرۆدەیان کردبووم و منی بە بەندیخانە ئەسپارد، بۆیە دوای ئەوەی کارمەندێکی بەندیخانە دوو چایەی بۆ هێناین دەستی کرد بەگێڕانەوەکانی :

نەجیب ئینسانێکی نەجیب بوو، کوردانە بیری دەکردەوە، نیشتمانی لە چاوی خۆی خۆشتر دەویست، پانزە ساڵ زیاتر بوو شاری بۆکانی بەجێهێشتبوو، بۆکان بۆ ئەو نیشتیمانێکی سەربەخۆ بوو، هەر جارێك ناوی ئەم شارەی بەر گوێ بکەوتایە، بە بێدەنگی دەگریا، بە ناوهێنانی شارەکەی، دەگەڕایەوە بۆ ئەو زەمەنەی تیایدا ژیابوو، ئاوێتەی یادەوەریەکانی دەبوو تەنانەت تیای دەتوایەوە و وەك سەرخۆشی لێ دەهات و وڕ دەبوو.

شەوێکی چڵەی زستان لە ماڵەکەی خۆی دەردیسەری خۆی بۆ باس کردم، تاوێك دەگریا، بەغەمگینییەوە چیرۆکەکانی

دەگێڕایەوە و پێکەوە گریی دەدان دیسان بێدەنگ دەبوو، ئینجا دەستی دەکردەوە بە قسە کردن، هەندێک جار بێسەروبەری و پەرش و بڵاوی بە قسەکانیەوە دیار بوو کە ئەویش سەرەنجامی خەمێکی قووڵ و ئاوێتە بوونی بوو بە خەمەکانی، ئەو لە بیری نەدەچووەوە کە دایکی چۆن کوژرا و خۆی چۆن دەربەدەر کرا؟

ئەو شەوەی حیکایەتەکانی خۆی بۆ کردم ڕەهێڵە باران بوو، لەو شەوە دەچوو کە هێزێکی پاسدار هەڵیانکوتابوە سەرماڵیان، ڕەهێڵە باران وەك نیشانەیەکی شوم وابوو بۆ خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی، بۆیە هەر جارێك باران لە شێوەی ڕەهێڵ بوایە، لەو ڕووداوانە ڕۆ دەچوو کە تیایدا دایکی لە دەست دابوو.

تا هەشت مانگیش لەدوای ئەو ڕووداوە نەجیب ئاگاداری وەزعییەتی ماڵی خۆیان نەبوو، کاتێك نەجیب نامەیەك بۆ دایك و باوکی دەنوسێ تا هەواڵی سەلامەتی خۆی بە وان ڕابگەیەنێ، ئەوانیش حەبیبی کوڕیان ڕادەسپێرن سەردانی باشوور بکات و بڕێك پوڵی بۆ ببات، ئنجا لە زاری حەبیبی برایەوە زانی دایکی بە گوللەی پاسدار شەهید بوە، دوو ڕۆژ بێپسانەوە گریا و لالابوویەوە بۆ مەرگی دایکی، زۆربەی دڵتەنگییەکەی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە خۆی بە هۆکاری مردنی دایکی دەزانی، پێی وابوو گەر ئەو نەبوایە دایکی لەبەین نەدەچوو.

نەجیب چەند ساڵێك بەر لەوەی بۆکان بەجێبهێڵێ، لە ڕێگەی کادرێکەوە پەیوەندی دەکات بە ڕێکخستنە نهێنییەکان، لە ماوەی دوو ساڵ دا خەریکی خۆ وشیار کردنەوە دەبێ بە خوێندنەوەی کتێب و ئەدەبیاتی سیاسی گەلانی ناوچەکە، تێگەیشتن و هۆشیارییەکی قوڵ و گشتی بەدەست دێنێت و کار

کردن بۆ پارتە کوردیەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی بە پێویست دەزانێ.

ئەو بە حەماسەتێکی زۆرەوە کاری ڕێکخستنی ئەنجام دەدا، بەردەوام هەوڵی دەدا مەسەلەی کورد و مێژووی کورد و مافی کورد لەو پارچەیە بۆ هاوڕێکانی شیبکاتەوە، خەڵك بەگشتی و گەنجانی شار بەتایبەتی لەو ڕاستیانە تێبگەیەنێ، تێگەیشتنێکی نوێ بداتە خەڵك دەرهەق بە دەسەڵاتدارانی ئێران و ڕوانینیان بۆ مەسەلەی کورد.

نەجیب هیلاك نەدەبوو لە خوێندنەوەی کتێب و سەردانی کردنی گەنج و لاوانی شارەکەی، تاکوو دیدێکی تازەیان پێ بدات لەسەر نەتەوەی کورد، بۆ ئەوەی وایان لێبکات نیشتمان و گەلی خۆیان خۆشبوێ و ئامادە بن خۆیان لە پێناوی نیشتمان بەخت بکەن، لەو ماوەیەی کاری ڕێکخستنی ئەنجام دەدا، دەیان گەنجی هێنایە ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە، چەندین کتێبی قەدەغەکراوی هێنایە ناو شارەوە، مەرجی ئەندام بوونی بەستبووەوە بە خوێندنەوەی کتێبەکان و گفتوگۆ کردنیان لەبارەی ناوەرۆکی کتێبەکان.

هەموو هەفتەیەك چەندین گەنجی لەماڵەکەی خۆی کۆ دەکردەوە، سەرەتا بەسێ مانگ زۆربەیانی فێرە خوێندنەوە و نووسینی کوردی کرد، چونکە زۆربەیان نەیاندەزانی بەکوردی بنوسن و بخوێننەوە، هەر لە ماڵەکەی خۆی جۆرێك لە سمینار و کۆڕی ئەنجام دەدا، لە سەرەتادا خۆی کتێبەکانی بۆ دەخوێندنەوە لەبەر ئەوەی هاوڕێکانی نەیاندەزانی کتێبی کوردی بخوێننەوە، ئنجا پێکەوە گفتوگۆ و مشتومڕی گەرمیان

ئەنجام دەدا لەسەر ناوەڕۆکی کتێبەکە.

چەند مانگی سەرەتای کۆششەکانی چڕ کردبووەوە لەسەر کتێب و بایەخ و گرنگی خوێندنەوە و جیهانبینی و ناسینی خود و دەوروبەر، دەیویست گەنجانی شارەکەی، خۆیان بە خوێندنەوە سەرقاڵ بکەن لەجیاتی شتی پڕوپوچ، دەیویست لە ڕێگەی کتێبەکانەوە گەنجەکان بزانن چ زوڵمێك لە نەتەوەکەیان دەکرێت، ئەو پرسیارەی دەورژاند : بۆچی کورد دەوڵەتی نەبێ ؟

پێشتر ئەو گەنجانە ئەم پرسیارەیان بە خەیاڵدا نەهاتبوو، هەرگیز وەها پرسیارێکیان لە خۆیان نەکردبوو، بەڵام ئێستا خەریکە لە خۆیان دەپرسن بۆچی کورد دەوڵەتی سەربەخۆی نەبێ ؟

دواتر نەجیب ئاراستەی گوتار و ئامۆژگاریەکانی گۆڕی و پرسیارەکەی : بۆچی کورد دەوڵەتی نەبێی کردە سەرەتای باس و خواسی سیاسی .

پێی دەگوتن : واز لەپوڵ بێنن گەر دەوڵەتمان هەبێ پوڵیشمان زۆر دەبێ، گەر پوڵیشمان زۆر بێ مادام دەوڵەتمان نەبێ هەر هەژار و دەستکورتین.

هەمیشە ئەم ڕستەیەی بۆ دووبارە دەکردنەوە.

چەند مانگی دوای ئەوە تەرکیزی خستە سەر تێکەڵ بوونی گەنجەکان بە کاری سیاسی و پێی گوتن نابێ دابنیشن، تا بە ئارەزوی خۆیان و بێ هیچ ئاستەنگێك درێژە بدەن بە چەوساندەوە و داگیر کردنی نیشتمانەکەتان، دیسانەوە لێی پرسین : بۆچی

ئێوە لە خاك و ئاوی نیشتمانی خۆتان سودمەند نەبن و کەڵك وەرنەگرن ؟ بۆچی ئەوان بەرهەمی باخ و کێڵگەکانتان بخۆن ؟ بۆچی ئەوان هەموویان ماشێنی نوێیان هەبن ئێوە نەتانبێ ؟ بۆچی ئەوان هەموو ماف و سەربەستییەکیان هەبن، بەڵام ئێوە هەمان ئەو ماف و سەربەستیانەتان نەبێت؟

نەجیب هەست و تێگەیشتنێکی نوێی بەخشی بە دەیان گەنجی شاری بۆکان و فێری کردن کورد و فارسیان پێ جیابکرێتەوە و دەیان پرسیار لە خۆیان بکەن لە سەرویانەوە : بۆچی کوردیش وەك فارس دەوڵەتی نەبێ؟

سەروەختێك کادرەکەیان بە کۆمەڵێك بەڵگەنامەوە دەستگیر کرا و ناوی بەشێك لە ئەندامەکانی حزبی پێ ئاشکرا کرا، سەیر لەوە بوو دەوڵەت نەکەوتە ڕاوەدونان و دەستگیر کردنی ئەندامە ئاشکرابوەکان تەنها نەجیب نەبێت.

وەك خۆی گێڕایەوە ئەو ئاگادار نەبوو لە گیرانی کادرەکەیان، تەنها ئەوە نەبێت ماوەیەکی زۆر هیچ سەروسەودای نەبو و بەدەرنەدەکەوت، ئەویش پێی وابوو لە سەفەردایە یان کارێکی بۆ پەیدا بوە و سەرقاڵە بە ژیانی خۆیەوە.

ئەو شەوە بارانەی باسی دەکەم نەجیب گوتی:

-شەوێك کاتژمێر لە دوازە تێپەڕیبوو، لەژێر ڕەهێڵی باراندا لەماڵی قانیعی هاوڕێم دەگەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان کە لەوێ کۆمەڵێك نوسراوی حزبمان تاوتوێ کرد، دەمانویست بەسەر ئەندامانی حزب دابەشی بکەین، کاتێك لە کۆڵانی پشتەوەی ماڵی خۆمان هێزێکی سەربازیم بەدیکرد لە حاڵەتی ئامادەگیدا

بـوون، هەندێـك لـە چەكبەدەسـتەكان جلـی كوردیـان لەبـەر بـوو، كاتێـك مـن گەیشـتمە بـەر دەمیـان بـواری گەڕانـەوەم نەمـا و نەمتوانـی خـۆم لـە دەسـتیان دەرباز بكـەم، بۆیـە بەناچـاری بەنـاو گەلـە چەكـدارەكان دا بـەرەو ماڵـەوە ملـی ڕێـگام گـرت.

نووسـراوە چاپكراوەكانـی حزبـم لـە ژێـر جلەكانـی بـەرم حەشـار دابـوو، دەترسـام پێـوەی بگیرێـم و نووسـراوەكان ببـن بەڵگەنامـە لەسـەرم، دوور نەبـوو بەهۆیـەوە لـە سـێدارە بدرێـم و دواتـر بـە خەڵـك بڵێـن نەجیبـی خوانەنـاس پەلامـاری خوشـكی خـۆی دابوو، بۆیـە لەسـێدارەمان دا. لـەو بارەیـەوە ئەزمونێكـم لەبـەر چـاو بـوو، هاوشـارییەكم بەنـاوی نەزیـر پێشـمەرگە بـوو، شـەوێك بـۆ ئەنجامدانـی هەندێـك كاروبـاری حـزب بەنهێنـی دێتـەوە شـاری بـۆكان، لـە كاتـی گەڕانـەوەی كەوتـە نـاو بۆسـەی چەكدارانـی سـوپا و بـە برینـداری گیـرا، لـە نەخۆشـخانە چارەسـەریان بـۆ كـرد و خزمەتێكـی باشـیان كـرد تـا بەتـەواوی چـاك بویـەوە، ئنجـا دواتـر خەڵكیـان بـۆ كۆكـردەوە و لـە ناوەڕاسـتی شـەقامی ئـازادی لەسـێدارەیان دا، نەزیـر لـەدوا چركـەی هەناسـەدانی گوێـی لـە حاكمـی شـار بـوو كـە بـە مایكرۆفـۆن قسـەی بـۆ حەشـاماتەكە دەكـرد و دەیگـوت بـا هەمووتـان ئـەوە بزانـن بۆچـی نەزیـر لەسـێدارە دەدەیـن؟ ئـەم پیـاوەی لە دواسـاتی ژیانیدایـە پەلاماری خوشـكی خـۆی دا، شـەرع و یاسـا حەرامی كـردوە بەچـاوی خراپ تەماشـای خوشـكی خۆمـان بكەیـن كەچـی ئـەم پیـاوە مەلعونـە لاقـەی خوشـكی خـۆی كـردوە.

ئـەوەی جێگـەی خـەم بـوو نەزیـری قوربەسـەر هـەر خوشـكی نەبـوو، ناهیـدە خانمـی دایكـی سـەردانی چەندیـن پزیشـك و

نزرگە و شێخ و مەلای کردبوو تا خودا کچێکی پێ ببەخشێت، بەڵام پێی نەبەخشیبوو، کەچی تۆمەتی ئەوەی درایە پاڵ کە پەلاماری خوشکی خۆی داوە، حەشاماتی بەردەم تەرمەکەش کە هەموویان هاوزمان و هاوخوێن و هاوشاری بوون هاواریان دەکرد: مستەحەقت بێت پەلاماری خوشکی خۆت دەدەیت هەی بێناموس.

لە هەموو لایەکەوە دەستخۆشی لە حاکمی شار دەکرا، بەدڵخۆشییەوە هەڵدەپەڕین و شادومانی خۆیان دەردەبڕی، بێئاگا بوون لەوەی نەزیر هەر خوشکی نەبوو بەڵکوو لەسەر کوردایەتی لەسێدارە دەدرا.

هەندێك گەنج کە لەناو حەشاماتەکە بوون بەناو خەڵکەکە دا دەگەڕان و حاکمی شاریان بەدرۆ دەخستەوە و دەیانگوت: ئەم پیاوە پێشمەرگە بوە و بەدیل گیراوە، لەسەر کوردایەتی لەدار دەدرێت ئەو هەر خوشکی نیە. دڵم بەو گەنجانە خۆش بوو، منیش وەك ئەوان کە هەموومان هاوخوێن و هاوزمانی نەزیر بووین ئەوەی لێی نەترسابام پێم دەگوت نەزیر هەر خوشکی نیە تا لاقەی بکات، بەڵکو لە تێکۆشان دا دەستگیر کراوە، تا ڕادەیەك توانیمان زۆرینەی خەڵك لەم ڕاستیە تێبگەیەنین، بەمەش پیاوانی دەوڵەت کەوتنە تاقیبی ئەوانەی حاکمی شاریان بەدرۆ خستەوە.

بەدەم ڕێگاوە کە لەناو ترسێکی زۆردا هەناسەم دەدا، بیرم لەو چرکە ساتە دەکردەوە کە پەتەکە دەخەنە گەردنم و دایك و باوکم لەبەر دەمم دا بە تەماشا کردنێك بەچاوی پڕ فرمێسکەوە پێم دەڵێن: ئەی کوڕم نەمانگوت دانیشە کورد بە تۆ ڕزگار ناکرێ؟

لە ناوەڕاستی کۆڵانەکەی خۆمان پلەدارێکی سەربازی کە چوار سەرباز پاسەوانێتیان دەکرد بە زمانی فارسی بێ هیچ هەڵچوون و توڕەییەك لەژێر ڕهێڵە باران و ڕووناکی گڵۆپی سەر شەقامەکان بەهێمنیەوە لێی پرسیم : کوڕۆ ناسنامەت پێیە؟

ڕهێڵە بارانەکە بەردەوام بوو، وشکایی لەجلەکانی من و سەربازەکانیش نەمابوو، ئەوان باران سەخڵەتی نەکردبوون و بە هێمنی لەئەرك دا بوون، منیش بەدەم ترس و لەرزی سەرماوە دوو هەنگاو چومە پێشەوە و ناسنامەکەم لە باخەڵم دەرهێنا و دامە دەستی، پلەدارەکە تاوێکی کەم ڕوانیە سەروسیما و دەموچاوم، تاوێکی تر ڕوانیە ناسنامەکەم، بە دەستی ڕاستی ناسنامەکەی بەرەو من ڕادا ئنجا گوتی: کوڕۆ ئێمە دەزانین تۆ کێی فەرمو بڕۆ.

زیاتر ترسام کە گوتی ئێمە دەزانین تۆ کێی، ئەوسەری کۆڵانەکەی تریش بەسەرباز تەنرابوو، یانی هیچ بوارێك نەمابوو بۆ خۆ دەرباز کردن، بە ناچاری چەند جارێك لەدەرگای حەوشەم دا، تا دەرگایان لێکردمەوە و چوومە ژورەوە، لە ژووری دانیشتن دایکم و باوکم سەرکۆنەیان کردم و بە جووتە گوتیان کەی ئێستا کاتی هاتنەوەیە؟

توڕە بونێکی زۆریان پێوە دیار بوو، بەڵام وا هەستم کرد توڕەبونەکەیان هەڵگرتبێت بۆ کاتێکی تر و پەنگیان دابوەوە لە ناخیان، لەبەر ئەوەی کاتژمێر لە دوانزەی شەو تێپەڕیبوو. ئەوان نەیاندەزانی کۆڵانەکەمان و دەورووبەریماڵەکەمان بە سەرباز تەنراوە، تەنها من نەبێت، دایکم بەئاسپایی گوتی: ڕۆڵە ئاوها نەخەوی بڕۆ جلەکانت بگۆڕە با نەخۆش نەکەوی.

هێشتا دایکم دواین وشەی لەدەم دەرنەچو بوو، هێزە چەکدارەکەی کۆڵان بەسەر دیوار و دەرگای حەوشەدا گەیشتنە دیوی ژوورەوە و چەند فیشەکێکیان ئاراستەی ژوورەوە کرد، دەنگی تەقاندنی فیشەك و قرمەی شکانی شووشەی پەنجەرە و دەنگی تێخوڕینی سەربازەکان و زریکەی دایکم تێکەڵ بوون.

تا سێ مانگیش دوای ڕووداوەکە، ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکرد: بۆچی ئەفسەر و سەربازەکان لە کۆڵانەکە دەستگیریان نەکردم، بەڵکو ژوورەوەیان دایە بەر ڕێژنەی گولله؟ دوای ئەو ماوەیە ئنجا زانیم کوشتنی من لە ماڵ بۆ دەوڵەت باشتر بوو، بەلایەنی کەم دەیانکردە کوشتنێکی تەمومژاوی و لەسەر دەوڵەت نەدەکەوت، بەراورد بەوەی بمبەنە بەردەم دادگا و لە ڕێگەی دادگاوە بمکوژن.

لەو چرکە ساتە دەبوو بڕیار لە چارەنووسی خۆم بدەم، یان خۆ ڕادەست کردن یان ڕاکردن، بواری ڕاکردنیش زۆر کەم بوو، یانی نەمدەزانی لەڕاکردنەکە دا سەرکەوتوو دەبم یان دەستگیر دەکرێم، دوا جار بڕیاری ڕاکردنم دا، هەر ئەوەندەم پێکرا باوك و دایکم بەجێبهێڵم و بە قادرمەکەدا سەربکەومە سەر خانو و بە قەڵەمبازێك بگەمە سەر خانووی هاوسێی پشتەوەمان و لە حەوشەی ئەوانەوە لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان تێتەقێنم و خۆم بگەیەنمە هەڵەت و پەڵەت.

ئیدی بوومە قاشقونج، ئەو چەند مانگەی لە ئەشکەوت و زەنوێر و بێشەڵانەکان مامەوە بە سەختی ژیانم بردە سەر، چونکە وامدەزانی هێزە چەکدارەکان لە هەموو شوێنێك بەدوامەوەن، نەمدەتوانی خۆم نیشانی کەس بدەم تاکوو بە ئاسانی نان و

پێخۆرم دەستبکەوێت، دواتر کەمێك هێور بومەوە و پەنام بۆ ئاوەدانی و شوان و گاوان و وەرزێری گوندەکان برد و داوای پێخۆرم لێکردن .

ژیان لەو چەند مانگەدا بۆ من سەخت بوو بەتایبەتی زستانەکەی، چەندین شەو لە کولانەی سەگ و هۆلی مەڕو مالات و لە ناو کادێن خەوتووم و بەرەبەیان ڕۆیشتووم تا خەلك نەمبینێت، چەندین شەو پێخەفم کورتانی کەر و ئێستر بوە گەرم گەرم لە ناویدا نوستووم و خەونم بە ژیانی ئارامەوە بینیوە، چەندین شەو هاوڕێی شەوگاری پرمەی ئەسپ و نوسکەنوسکی سەگ و گوجیلە و قوقەی کەلەباب بووم، ئێستاش غەدرێکی خۆمم لەبیر نەچۆتەوە کە شەوێکیان لە کولانەیەك پالمدابوەوە، هێشتا چاوم نەچوبوە خەو کاتێ دێلە سەگێکم بینی خۆی و گوجیلەکانی ویستیان بێنە ژوورەوە، بەلام کە منیان بەدیکرد لەبەردەم کۆلیتەکەیان وەرکەوتن، ئەو شەوە تا بەرەبەیان بەسزمانانە لەبەر من سەرما و کزەبا تەزاندنی بێئەوەی هەولی دەرکردنم بدەن، گوجیلەکان لەپال دایکیان گرمۆلەیان کردبو و لەسەرما خۆیان بە دایکیانەوە نووساندبوو، بەوەوە نەوەستام کە شوێنی خەوتنیانم زەوت کرد، بەلکو ئەو وردکە نانەی کە لە ناو کۆلیتەکەیان بوو ئەوەشم خوارد، ئەو شەوە ئەوان خانەخوێیەکی دل نەرم بوون بۆ منی برسی و بێلانە.

چەند جارێك بیرۆکەی گەڕانەوەم لا گەلالە دەبوو، بەلام هەموو جارێك چیرۆکی لە سێدارەدانی نەزیرم دەهێنایە پێش چاوی خۆم و لەو بڕیارە پاشگەز دەبومەوە، ئەو ڕۆژەی نەزیر لەسێدارە درا لەناو حەشاماتەکە دەهاتم و دەچووم، لە پشتی سێ چوار

گەنجەوە ڕاوەستابووم، یەکیان دەیگوت: ئەم نەزیرە تاقانەی نێو حەوت خوشکە، هەموو خوشکەکانی یەك لەیەك جوانترن بەتایبەتی ئەوەی ئەم سەگە پەلاماری داوە زوڵێخایەکە بۆ خۆی هێندە جوانە، خەڵکەکە دەیان چیرۆکی سەیر و سەمەریان بۆ دادەتاشی و لەکۆتایی هەموو چیرۆکە دروستکراوەکاندا نەزیر بە تاوانبار و ڕوو ڕەش نیشان دەدرا، لە هەمان کات دا من و چەندین کەسی تر هەبووین کە چیرۆکە داتاشراوەکانمان بەدرۆ دەخستەوە و ڕووی ڕاستی دەسەڵاتدارانی ئێرانمان پیشانی حەشاماتەکە دەدا .

ئاخر خۆ نەزیر نە دز بوو، نە تریاك کێش، کەچی لەسێدارە درا، دەمزانی گەر بگەڕێمەوە هەمان چارەنووسی ئەوم دەبێ، لە لایەکی تر هیچ هەواڵێکی دایك و باوکمم نەدەزانی، نەمدەزانی ئایا لەحەپسخانەکانی تاران بەند کراون یان نا؟ لێیان دراوە یان نا؟ ئەم بێئاگاییەم لە هەواڵیان زۆر پەرێشانی کردبووم.

پرسیارم لە خۆم دەکرد هەر ماوەیەکی کەم دەتوانم خۆم وەشێرمەوە و حەشار بدەم و قاشقونج بم، ئەی دوای ئەوە چیبکەم؟ زۆر جار بەخۆمم دەگوت لەسێدارە بدرێم باشترە لەوەی بێئاگا بم لە هەواڵیان، خۆ ئەگەر بگەڕێمەوە دەزانم خێزانەکەمان چیان لێ بەسەر هێنراوە، دیسان و جارێکی تر چیرۆکەکەی نەزیر مێشك و بیرکردنەوەی زەوت دەکردم، تا دوا جار پاش شەش مانگ لە ژیانی تەنهایی و قاشقونج بوون، بڕیارم دا بەرەو سەر سنووری باشوور بەڕێبکەوم و لەوێ بژیم، چوونکە ژیان بە تەنهایی و ترس و برسێتی نەدەچوە سەر، سەرەتا نیەتم ئەوە بوو ببم بە پێشمەرگە، بەڵام ناکۆکی و

ناتەبایی نێوان پارتە کوردییەکان پاشگەزی دەکردمەوە لەو بڕیارە، چوونکە پێم وابوو من ناتوانم هیچ لە دۆخەکە بگۆڕم .

شارەزای ڕێگاوبانی ناوچەکە نەبووم، لەبەر ئەوە دەبوو بۆ گەیشتن بەسنوور ناوە ناوە پرسیار لە ڕێبوار و گاوان و شوان بکەم تا ڕێم پێنیشان بدەن.

سەروەختێك کە گەیشتمە گوندەکانی سەر سنوور بارودۆخم لەوپەڕی شپرزەییدا بوو، بەرگێکی چڵکن و تۆزاوی و کۆن و بێکەڵکم لەبەر بوو، پرچ و ڕیش و سمێڵم تێکەڵی یەکتر ببوون و ڕووخسارم لەخۆمەوە دیار نەبوو ئەگینا لەدێوانە دەچووم و شێوەم زۆر نامۆ بوو، زۆربەی ئەوانەی نان و پێخۆریان پێدەدام و ڕێیان پێنیشان دەدام وایاندەزانی شێتم، شێوە و ڕوخسار و تەنانەت قسەشم لە شێت دەچوو، هەندێك جار ورێنەم دەکرد و لەبەرخۆمەوە قسانم دەکرد.

من هیچ پوڵم پێنەبوو، بۆ ئەوەی کە گەیشتمە باشوور پێی بژیم و کارێکی پێبەدەست بهێنم، بیریشم لێنەکردبووەوە تا ئەو کاتەی توشی پیرەمێردێك بووم .

ئەو وەختەی من لەسنوور نزیك کەوتبوومەوە مانگی پوشپەڕ بوو، گەرما تینی بۆ هێنابووم و لە سەد هەنگاودا توێنیم دەبوو، بە تولە ڕێگایەکی باریکی پێچاوپێچ و هەورازێکی ڕك دا هەنگاوم دەنا بەرەو سەرەوەی ئەو کەژەی لە بەرانبەرم بوو، بە گوێرەی قسەی شوانێك لە سەری کەژەکە دیوی باشوورم لێبەدەر دەکەوت، لەناوقەدی هەورازەکە لە ناو باخێکی ترێ پیرەمێردیکم بەدیکرد، پیرەمێردەکە خەریکی کار کردن بوو،

لە دوورەوە ماندو نەبوونم لێکرد و پرسیم زۆرم ماوە بگەمە سەر سنوور؟ باخەوانە پیرەکە کورتەکێکی قۆچپەداری لەبەر بوو لەگەڵ دەرپێیەکی سپی کە لەچڵکنی دا ڕەنگی مەیلەو بۆر خۆی نیشان دەدا، کڵاوێکی لە سوف دروستکراوی لەسەر بوو، فەرمووی لێکردم کەمێك پشوو بدەم و هێشویەك ترێی لا بخۆم، خۆشم حەزم لەترێ هەبوو، دەمویست هەم ماندوێتیم دەربکەم و هەمیش قومێك ئاو بخۆمەوە.

لە ڕچە ڕێیەکە بە ئاراستەی پیرەمێردەکە بەناو پوش و پەڵاش و دڕکە شینکە و قەلەغوان و بنچکە خڕنوکەکان دا لامدا، بنچکە خڕنوکەکان زۆریان پێوە بوو، وێنەی ئەو تابلۆیەم هاتە بەرچاو کە باوکم کاتی خۆی بە چەند تمەنێك لە تاران کڕیبوی و لە ژووری میوان هەڵیواسبوو، تابلۆکە وێنەیەکی ڕاستەقینەی بنچکێکی خڕنوك بوو، کە چاوم دەبڕییە تابلۆکە تامەزرۆی دەکردم، تابلۆکە دەیگێڕامەوە سەردەمی منداڵیم کاتێك قلە خڕونکمان بە بەردی زبردا دەهێنا، تا توێکڵەکەی پێپاك بکەین، ئەو دەمەش هەم تابلۆکە و هەم سەردەمی منداڵیمی هێنایەوە یاد.

بەسەر پەرژینی دڕکاوی باخەکە بازم دا، بەدوو لۆق خۆم گەیاندە پیاوە باخەوانەکە، هەتا من گەیشتم ئەو چەندە هێشوە ترێیەکی ڕەشی قەترانی لێکردبووەوە، تەوقەمان کرد و گوتی:

-کاکی ڕێبوار شەکەت دیاری، بۆچی دەچیتە سەر سنوور خۆ قاشقونج نیت؟

وەك بڵێی لەسەر و سیما و جلوبەرگەکەم تەواوی چیرۆکەکەمی خوێندبێتەوە، بێ ئەوەی بیناسم لەنوکەوە تەواوی سەرگوزشتەی خۆمم بۆ گێڕایەوە، ئەو دڵسۆز و پەرۆش دەردەکەوت، سیما و تەمەن و شێوازی قسەکردنی وایلێکردم متمانەی زۆرم پێی هەبێ و لێی نەترسم، پێی گوتم:

-ئەم ناوچەیە شوێنێکی دوورە دەستە و کەس لێرە ناتناسێ و دەوڵەتیش دەستی پێت ناگات، ئەگەر دەتوانی و لەخۆت ڕادەبینی پانزە بیست ڕۆژێك لای مامی خۆت بمێنەوە، هاوکاریم بکە لە ترێ ڕنین کرێیەکی باشت پێدەدەم، هەر لێرە لەناو ئەم باخە کەپرێکت بۆ دروست دەکەم شەوان لەسەری بنوی، بە ڕۆژەوەش لەکاتی دەستبەتاڵی لە سێبەری ئەو دار گوێزە زەلامە پاڵکەوە، ڕۆژانەش پێخۆرت بۆ دێنم و ناهێڵم برسی بیت، هەروەها کەرەستەی ڕدێن تاشین و جلوبەرگێکی تازەشت بۆ دێنم و هەر خۆم لێرە سەرو پرچت کورت دەکەمەوە.

لەخۆشیا خەنی بووم، بێ بیرکردنەوە پێشنیارەکەیم قبوڵ کرد، من پێویستیم بەو بڕە خەرجیە هەبوو، بۆ ئەوەی دوای گەیشتنم بە باشوور پێی بژیم و هەوڵی دۆزینەوەی کارێکی پێبدەم، هەم بە خۆشۆرین و تراش کردن سیمای شێواوم ئاسایی بکەمەوە.

دانی ئێوارەی ڕۆژی یەکەم باخەوانە پیرەکە تەورێکی تیژی هەڵگرت و گوتی وەدوم کەوە، بە ڕچە ڕێیەکی ڕك و پێچاوپێچ دا بەرەو خوار وەدوی کەوتم بۆ ناو چەم و بێشەڵانێکی چڕوپڕ، چەمەکە داری زەبەلاح و پیرو کەنەفت و کلۆری زۆر بوو، تیشکی خۆر بەدەگمەن نەبێت لە ناو چەمەکەی نەدەدا هێندە پڕ و چڕ بوو، ژێرەوەی دارەکانیش لە حەوشە دەچوون،

سمۆره قەڵەمبازی بوو لە نێو دارە کلۆر و بەساڵاچووەکان و لەهەموو لایەکەوە جریوەی باڵندەی جیا جیا دەهات، ڕووبارە پێچاوپێچەکەش گەر لە بەرزاییەوە تەماشات بکردبا لە مارێکی شینی زەبەلاح دەچوو خوڕەی دەگەیشتە بەرگوێمان.

هەر خۆی بەتەورەکە چوار دووگوێ و شەش داری ڕایەڵە و هەندێك ژاژ و جەگەنی بڕی و پێکەوە کێشامانەوە ناو باخەکە و کەپرەکەمان دروست کرد.

شەوی یەکەم لەسەر کەپری باخەوانە پیرەکە لێی ڕاکشام، کزە بایەکی فێنك گەڵای درەختەکان و چڵ و چێوی باخەکەی دەلەراندەوە و خوڕەی ئاوی کانیاوەکە، کە لە باخە مێوەکەی دامەزراندبوو ئاوازێکی غەمگینی بە گوێچکەم دا دەچرپاند، لە ئاوازی گۆرانیەکەی ماملێ دەچوو کە لەچایخانەکەی مامە عەزە بەکزی لە نەوارەکەی دەردەچوو، ماملێ گۆرانی دەگوت و مام حەمەمینی تەوقە و مام عەلی خورجە کە تەمەنیان لە حەفتا ساڵ تێپەڕیبو و سەرو چاویلکەیەکی گەورەیان لەچاو کردبوو لەسەر مێزێکی شەق و شڕ دۆمینەیان دەکرد، ئەم هەڕەشەی لەو دەکرد و ئەویش ئەمی بێمنەت دەکرد، لای ئەوان دنیا شامی شەریف بوو.

جۆگەلە ئاوەکە لەناو کارێزێکەوە هەڵدەقولا و بەڕێڕەوێکی داخوڕاو و تەنگەبەردا بەناو تاشەبەرد و دار و دەوەنە سروشتکردەکان دەهاتە خوارەوە و باخەوانە پیرەکە ئاوەکەی خستبوە ناو حەوزێکی چوارگۆشەی لەبەرد و چیمەنتۆ دروستکراو، پێی دەگوت ئەستێرە، هەندێك جاریش پێی دەگوت ستێڵ، لەوێوەوە دابەشی کردبوو بەسەر چەند

جۆگەیەکی لاوەکی و دەیگەیاندە زۆرینەی درەختەکانی، لە هەردوو بەری جۆگە سەرەکییەکە پونگە و فریزی سروشتی وێکهاتبونەوە سەر ئاوەکە، بەڕۆژەوە پەپوولە و مێشهەنگ و زەردەواڵە لەسەریان دەهاتن و دەچوون، لەوێ زەردەواڵەکان لەبۆسەدا بوون بۆ مێشهەنگەکان، باخی باخەوانە پیرەکە تەنها بریتی نەبوو لە مێو، بەڵکو پڕ بوو لەداری سێو و قەیسی و هەنجیری ڕەش و سپیندار و گوێز و بادەم.

ئەو شەوە کزە باکە بۆنی پونگە و دار و دەوەن و گوڵی سورشتی و بۆنی خاکی ئاودراوی بۆ دەهێنام لە بۆنی دایکم دەچوو، هەمان ئەو بۆنە بوو کە لەسینگی دایکم دەهات کاتێ کە لەئامێزی دەکردم و وەك منداڵێکی شیرەخۆرە منی بەخۆوە دەنوساند و سەری دەخوراندم و ماچی دەکردم، بۆنی گژوگیای ئەو شەوە منی بردەوە ناو یادەوەرییەکانم، بیری دایك و باوك و کەسوکار و هاوڕێکانم دەکرد، بیری شەقام و کۆڵانەکان و چایخانەکەی مامە عەزە و بیری کتێب و دانیشتنە شەوانەکانی زستانی ڕابردووم دەکرد، چاوم پڕ بوون لە فرمێسك، گریانم بۆ حاڵی خۆم دەهات کە تاکە هۆکارێك منی بەو ڕۆژە گەیاندبوو کورد بوون بوو، ئنجا باشتر زانیم کورد بوون چ زەحمەت و تاڵە، گەر لە ئێران نیشتەجێ بیت و کورد بیت بەشمەینەت دەبیت.

گەرچی لە باخەوانە پیرەکە دڵنیابووم کە بەگرتنم نادات و تەڵەم بۆ دانانێتەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت دەبوو بە پارێزەوە بخەوم، شەوی دووەم و سێیەم لەسەر گابەردێکی ناو باخەکە نوستم نەك لەسەر کەپرەکە بۆ ئەوەی گەر سەربازە دڵ ڕەقەکان بۆ گرتنیشم بێن، خۆمم پێ ڕزگار بکرێت.

بیست ڕۆژ مقەستێکی بچووك و قەڵتارەیەکی لە شوو دروستکراو کەرەستەی دەستم بوون، هێشوە ترێ ڕەشەکەم بە مقەستەکە دەبڕی و دەمئاخنییە ناو قەڵتارەکە و بەکۆڵم دا دەدا و دەمگواستەوە ژێر دار گوێزە زەلامەکە، دواتر دەمانخستە ناو سندوقی پلاستیکی، دوای ئەوە شوفێرێك سندوقە ترێکانی بار دەکرد و دەیبردە شار، جارێکیان شوفێرەکە بەدەم ترێ خواردنەوە پرسی : مامە خولە ئەم گەنجە کێیە؟ باخەوانە پیرەکەش خۆی لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی دەدزیەوە و دەیگوت ئەرێ ئەمڕۆ چەندی مانگە، شوفێرەکە ڕۆژی دواتریش هەمان پرسیاری کردەوە، بەڵام دیسان پیاوەکە خۆی لێ دزیەوە و پێی گوت ئەرێ ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟

باخەوانە پیرەکە کەسێکی گورجوگۆڵ و بەهێز و قسەخۆش و خاوەنی ئەزمونێکی زۆر بوو لە بواری باخداری، لە سەرەتای کارکردنم پێی گوتم : بڕۆ قەڵتارەکە پڕ لە ترێی جوان بکە و بۆمی بهێنە، ڕاستیەکەی ئەوسا نەمزانی قەڵتارە چیە، لێمپرسی قەڵتارە چیە؟ ئەویش بە قامکی شەهادەی تێیگەیاندم کە کامەیە، زانی نازانم قەڵتارە چیە بۆیە گوتی قەڵتارە لە داری باریکی شۆڕە بی دروست دەکەم کە پێی دەڵێن شوو، شوویەك کە بۆ قەڵتارە بەکاربهێنرێت نابێ لە پەنجە توتە ئەستورتر بێ، تەنانەت سەبەتە و تلیانە و زەمبیلی هەنگ و شەلەشیر و زۆر کەرەستەی تری لێ دروست دەکەم، سەبەتەی لەشوو دروستکراو بۆ نان تەڕکردن و تلیانە بۆ نان هەڵگرتن و زەمبیل بۆ بەخێوکردنی هەنگ و شەلەشیر بۆ هەڵگرتن و پاراستنی ماست و دۆ و شیر و کەرە و نفیشك بەکاردەهێنرێت.

لەو ماوەیە ڕەنگ و ڕوخسار و جلوبەرگم تا ڕادەیەك گەڕایەوە باری ئاسایی، هەموو ڕۆژ دوو جار لەدەم ڕووبارەکە خۆم دەشوشت و مەلەم دەکرد، لە ئاوێنە شکاوەکەی ژێر دار گوێزەکە سیمای خۆمم دەبینی و هەستم بە جۆرێك لە دڵخۆشی دەکرد، ئاوێنەکە وێڕای ئەوەی شێی زمستان تەڵخی کردبوو چەند درزێکیشی لە سەرەوە بۆ خوارەوەی تیابوو، کە لەناویدا لە خۆمم دەڕوانی شێوەم دەبوو بە چەند کەسێك.

جگە لە من هیچ کەسێکی تر لەو دەڤەرە نەدەژیا، شەوانی ناو باخەکە فێنك و ئارام بوو، جریوەی باڵندە و لوورەی چەقەڵ و مڕەی یەکانە بەشێك بوون لەو دەنگانەی شەوان بەر گوێم دەکەوتن، لەو ماوەیە لای پیاوە باخەوانەکە زۆر ئاسودە بووم، خۆزگەم دەخواست هەلومەرجی ژیانم ڕێی بدایە تا هەتایە لای ئەو پیاوە کارم بکردایە.

لە ماوەی بیست ڕۆژدا تەواوی باخە ترێکەیمان ڕنی و لە شار ساغی کردەوە ئنجا بانگی کردمە نزیك خۆی و بڕێکی باش پوڵی پێدام و تورەکەیەکی پڕ کرد لە تەماتە و پیاز و هەندێك ترێ و نان و پێی گوتم خۆ هیچ گلەییت نیە؟ گەر هەر گلەییەکت هەیە لەژێر ئەم دار گوێزە بۆ مامتی بەجێبهێلە تا لە داهاتودا سوودی لێوەرگرم.

گلەیی چیم هەبێت؟ ئەو چاکەی لەگەڵ کردم، دوای ئەوەی دەستیم ماچ کرد،ماڵئاواییم لێکرد عەسرێکی زوو گەیشتمە سەر تروپکی کەژەکە لە لاپاڵی ئەودیوی کەژەکە بەناو دەوەن و دارستانێکی چڕدا شۆڕبوومەوە، چاوم خستە سەر باریکە دووکەڵێك کە لە قووڵایی دۆڵەکەی بەردەمم ڕووەو ئاسمان

هەڵدەکشا.

-حەتمەن ئەو شوێنە ئاوەدانی لێیە . لەدڵی خۆم دا وامگوت.

لەسەری سەرەوەی دۆندەکە لەسەر گازەرای پشت لێی ڕاکشابووم و چاوی بڕیبوە قووڵایی ئاسمان، دەمویست پشوویەك بدەم. کەژەکە لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ لای ڕۆژئاوا بە شێوەی ئاسۆیی درێژ ببوەوە بەشیوەیەك کە لەپشتی گیانلەبەرێکی زەبەلاح بچێت، سەرەوەی کەژەکە ڕووتەن بوو و هیچ گیا و بنچك و بوار و درەختێکی لێنەڕوابوو لەبەر ئەوەی مشتێك خۆڵی تیا بەدی نەدەکرا و شاخێکی سەخت بوو، لە هەردوو دیویشی دا جۆرەها دار و دەوەنی لێ ڕوابوو، هەندێك شوێنیشی بە دارستانێکی چڕ داپۆشرابوو.

لەو بەرزاییەوە دەم سنورەکانم دەبینی کە بەدرەختی جۆراوجۆر و زەبەلاح و بەساڵاچوو داپۆشرابوون، دوای نیو کاتژمێر گەیشمە نزیك باریکە دووکەڵەکە کە هێشتا لەبەرز بونەوەدا بوو، ژن و پیاوێکی بەتەمەنم بەدیکرد، خەریکی پاك کردنەوەی کێڵگەکەیان و سوتاندنی پوش و پەڵاشەکانی ناوی بوون، ئەوان دوو بەدوو لەگەڵم هاتنە نزیك ڕووبارەکە و پێیان گوتم ئەوبەری ئاوەکە سنووری کوردستانە، لە دڵی خۆم دا گوتم خۆ ئەمبەریش هەر سنووری کوردستانە دووژمنەکانمان چۆن توانیویانە بیرمان داشۆرن و خاکی باب و باپیرانی خۆمان بە کوردستان نەزانین، ڕووبارەکە قوڵ نەبوو، بەڵام زۆر تیژڕەو بوو، لەبەر تیژی و لێژی قەراغەکانی کەفێکی سپی سپی دروستکردبوو، تاشە شاخ و بەردە زەلامەکانی ناو ڕووبارەکە بەربەستێکی لاواز بوون بۆ ئاوەکە، تەنها ئەوەندەیان پێدەکرا

ئاوەکە نیو مەتر هەڵبەزێننەوە پاشان بەشێوەی تۆزێکی سپی بکەونەوە ناو ڕوبارەکە و درێژە بدەنەوە بە ڕۆیشتن و خوڕەیان بگاتە لێواری چۆمەکە و شەپۆلی پێبدات.

لە ڕوانینم دا شوێنێکی شیاوم بەدیکرد بۆ پەڕینەوە، پەڕینەوە لە بەشێکی خاکی کوردستان کە تیایدا دەنگەکان کپ کرابوون بۆ بەشێکی تری کە تیایدا کورد خۆی حکومڕانی دەکرد، ئاوی ڕووبارەکە تا ناوقەدم دەهات، لەبەر تیژی سەرەو خوار دەیبردم و چەند جارێك خستمیە ناو ئاوەکە و هەڵدەستامەوە، لە لێواری بەری باشوور هێشتا پێم نەخستبوە بەیار لە پەنای دارێکی زەبەلاح ژنێك کەوتە بەرچاوم، ژنەکە کاوبۆیەکی شینی لەبەر بوو و سەرپۆشێکی تەنکیشی بە شان و ملیدا شۆڕ کردبووەوە، ژنەکە تەمەنی هەروا بیست ساڵێك دەبوو، لە ڕوخساردا جوان و قەشەنگ دەردەکەوت، کاتێك دیمەنێکی سامناکم بینی کە هەرگیز پێشبینیم نەدەکرد دیمەنی وا ناخهەژێن ببینم.

ئێستا کە ئەم ڕووداوەت بۆ دەگێڕمەوە گریانم دێت، خۆم چەند حاڵم پەرێشان بوو ئەو دیمەنە زیاتر پەرێشانی کردم، ڕووبارەکە سەراپا بەفراو بوو، مرۆ لەبەر ساردیی نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ لەناوی بمێنێتەوە، پێیەکم لەناو ئاوەکە مابوو پێیەکیشم لە بەیار، دەمویست بە قەڵەمبازێك پێیە تەزیوەکەم لەناو ئاوەکە دەربهێنم بەڵام دیمەنەکە هێندە سامناك بوو لە بیری بردمەوە کە پێیە تەزیوەکەم دەربهێنم، گوێم لە ژنەکە گرتبوو کە لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد، ژنەکە قۆڵی گەنجێکی لاواز و سەر و پرچ ئاڵۆزکاوی بە دەستەوە بوو، لە پەنای درەختە زەلامەکە کە ڕەگ و ڕیشەی شۆڕ ببووەوە ناو

ڕووبارەکە ڕووەو بەری ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەستا بوون، سەرەتا وامزانی ئەم ژن و پیاوە هاتونەتە دەم ڕووبار بۆ ئەوەی چێژ لە هاژە و خوڕەی ڕووبارەکە و جوانی کەنارەکان و گوڵە سروشتیەکانی لێوارەکەی وەرگرن، کەچی لە کتوپڕێکدا ژنەکە پاڵێکی بەهێزی بە گەنجەکەوە ناو خستیە ناو ڕووبارەکەوە و لەناو ژان و ناسۆری ئەو دیمەنە و خوڕەی ئاوی ڕووبارەکە گوێم لە ژنەکە بوو لەبەر خۆیەوە گوتی:

-بڕۆ، خوات لەگەڵ، ئیدی هەردووکمان دەحەسێینەوە.

ڕووبارەکە بەخێرایی جەستەی لاواز و شێواوی گەنجەکەی سەرەو خوار ڕامالی، تەنانەت گوێم لە نوزە و پاڕانەوەیەکی گەنجەکە نەبوو، لەوە دەچوو بواری پاڕانەوەی نەدابێ.

لێرە گێڕانەوەی چیرۆکی ژن و پیاوەکە ڕادەگرم دەمی خۆی دێت بۆ گێڕانەوەی، کەی کاتی هات ئاشنات دەکەم بە چارەنوسی ئەو ژن و پیاوە و پێت دەڵێم چیان لێبەسەرهات.

بەدەم خەم و ئازاری ئەو دیمەنە ناخ هەژێنە بەناو لێڕەوار و دارو دەوەنی ناوچەکە بەڕێکەوتم، هەر لەو نزیکانە دەمەو ئێوارە گوندێکی بچووك و دڵگیرم بەدیکرد کە لەناو داری زەبەلاح و جەنگەڵ و کەپکە شاخ ون ببوو، گوندەکە هەروا دە پانزە ماڵێك دەبوون، بەشی هەرە زۆری خانوەکانیان لەبەردی گەورە گەورە دروستکرابوو، هەندێکیشیان لە قوڕ و خشت، لە دامێنی گوندەکە ماڵێکی هەژارم کردە خانەخوێی ئەو شەوەم، خێزانە هەژارەکە خزمەتێکی بەرچاویان کردم، لە یادەوەریەکانم ناوی ئەو پیاوەم تۆمار کردوە کە چەندە بەرچاوتێر و ژنێکی

خزمەتگوزار و خانەدانی هەبوو، بەو گفتوگۆیانەی ئەو شەوە زانیم ناوی گوندەکە (چەقێن )ەو ژن و پیاوەکەی دەم ڕووباریش دانیشتوی چەقێن بوون.

ڕۆژی دواتر ماڵە هەژارەکە و گوندەکەم بەجێهێشت و بە پیکابێك بەرێکەوتم بەرەو شارەدێیەکی بچووك لە نزیك سنوور، هەر ئەو ڕۆژە بە چەند قۆناغ و چەند وێستگە و تەرمینالێك گەیشتمە شاری هەولێر.

یەکەم جارم بوو شاری هەولێر ببینم، یەکەم جارم بوو لە سێبەری دەسەلات و حکومڕانیەکی خۆماڵی بحەسێمەوە و کە پۆلیس و هێزی چەکدار ببینم لێی نەسڵەمێمەوە، سەرەتا کە گەیشمە باشوور لە بەرگی سەربازان و پۆلیسی کوردستان دەترسام وەك ئەوەی هێشتا لە شاری بۆکان بم، ناهەقیشم نەبوو، بەڵام دواتر ڕاهاتم و جیاوازی سەربازی کوردستان و ئێرانم بۆ دەرکەوت.

ئەو چەند ڕۆژەی سەرەتا کە لە سلێمانی و هەولێر بووم، هەستم بە ئاسودەیی دەکرد پێموابوو تازە لەدایك بووم، لە دەسبەتاڵی دا زۆربەی شوێنە گەشتیاری و شوێنەوارەکانم بەسەر کردەوە، ئەوسا زانیم کوردستان خاوەنی شارستانیەتی کۆنە و خۆمان لێی بێئاگاین، ئنجا نرخی ئازادیم باشتر زانی و بە خۆمم گوت: ئازادی و سەربەستی تێکۆشان و دڵسۆزی و پاکی و قوربانی دەوێت، دەبێت ئێمە لە ڕۆژهەلات بەو بڕواوە تێبکۆشین و داوا لە حزبەکانی ڕۆژهەڵات بکەین کە هەڵوێست و سیاسەتیان یەکبخەن و ببن بەخاوەنی یەك بەرنامەی سیاسی و فشاریان بخەینە سەر، چیتر ڕێگەیان نەدەین پەرت و ناکۆك بن .

لە هەولێر خێزانێکی بۆکانیم ناسی کە لەهەمان ئەو میوانخانەیە بوون من لێی مابومەوە، ئەوان بۆ گەشت ڕوویان لە باشوور کردبوو، هەر زوو بوینە ئاشنای یەکتر، بەو پێیەی هاوشاری بوین، ئەو چەند شەوە گفتوگۆی زۆرمان لەسەر بارودۆخی ڕۆژهەڵات و شاری بۆکان کرد، دەمەتەقێی زۆرمان لەسەر بارودۆخە گشتییەکە کرد، دواجار داوام لەو خێزانە کرد کە گەڕانەوە نامەیەکم بۆ بگەیەنن بە ماڵەوەمان، ئەندامانی خێزانەکەم هەشت مانگ بوو سەرو سۆراغی منیان نەدەزانی، پێویست بوو بە نامەیەك سەلامەتی خۆمیان پێڕابگەیەنم.

زۆری نەبرد دوای نامەکەم، حەبیبی برام گەیشتە باشوور و جەرگبڕترین هەواڵی پێڕاگەیاندم :

-ئەو شەوە بارانەی پاسدار پەلاماری داین دایکم لەبەین چوو.

بۆ من زەحمەت بوو، لە کتوپڕێك دا هەواڵێکی وا دڵتەزێنم پێگەیەنرێت، بەتایبەتی کە خۆم هۆکاری ئەو لەبەینچونە بم، تەنها دەمتوانی بگریەم و داوای لێخۆش بوونی لێبکەم، نەمدەتوانی ئەگینا دەچوومە سەر گۆڕی دایکم و لەوێ خاك و خۆڵی سەر گۆڕەکەیم ماچ دەکرد، پێمدەگوت: من بووم ژیانم لێت سەندەوە و خەم و خەفەتم دایە ئەوانی تر، بمبورە دایکە.

دوو ساڵ و چەند مانگێك لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان بە مۆڵەتێکی نارەسمی کارم کرد و بڕێك پوڵم پاشەکەوت کرد، لەو ماوەیە زۆر کەسم ناسی تا هاوکاریم بکەن لە دۆزینەوەی قاچاخچی و ڕۆیشتنم بۆ ئەوروپا، چوونکە لەوە بێ ئومێد بووم لە ڕیزی پارتە کوردییەکان خەبات بکەم، ئەوان

زۆر ناکۆك و ناتەبا بوون، هۆکاری ناکۆکی و جیاوازییەکانیشیان هێندەی لەسەر بەرژەوەندی کەسی و حزبی بوو هێندە بنەمای فکری نەبوو. لە سەرەتای مانگی ڕەزبەر خۆم تەسلیمی ئیرادەی قاچاخچیەك کرد.

خۆمم لەناو گروپێکی چواردە کەسی دا بینیەوە، لە ناویدا یازدە کورد و دوو عەرەب و یەك تورکمان و لەناو کوردەکانیش دا ژنێك و دوو منداڵ هەبوون.

بەرەبەیانێك قاچاخچییەکە بە ئۆتۆمبێلێکی سەرداپۆشراو لە نزیك شاری ( وان ) ئێمەی گەیاندە گوندێکی دوورە دەست لە ئەنادۆڵیا و لە گەوڕێك کە بەکرێی گرتبوو، حەشاری داین. گەوڕەکە پێشتر ولاغی بەرزەی لێ بەخێو کرابوو بێ پاك کردنەوە هەمووماني ئاخنیە ناوی.

عەسری هەمان ڕۆژ قاچاخچیەکە دوای پێدانی هەندێك ڕێنمایی لە دەرگای گەوڕەکە چوە دەرەوە, ئێمەی تامەزرۆ بۆ گەیشتن بە ئەوروپا دەبوو چاوەڕێی گەڕانەوەی قاچاخچیەکەو دابینکردنی خواردن و پێداویستی ڕۆژانەمان بین، خەونی ئەرخەوانیمان بە پاریس و بۆن و لەندەنەوە دەبینی، لەخەونی ئێمەدا هەمو شتێکیان فەراهەمە, کارەباو ئاوی بەردەوام، شەقامی پاك و تەمیز، بێ سڵەمینەوە سەمای کچەکان دەبینین و گوێمان لە مۆسیقا دەبێت، ئیدی گوێمان لە تەقەی تفەنگ و گرمەی بۆمب نابێت و چیدی تۆپ باران ناکرێین، لەوێ جەندرمە و پۆلیسی بەدخو نابینین و مافی هاوڵاتی بونمان مسۆگەرە, ئیتر ئازادین بەهەمو ماناکانی ئازادی، چیمان بوێ ئەوەمان بۆ دەلوێ.

ئێواره داهات قاچاخچییەکە دەرنەکەوت، پێمان وابوو شەو دەگەڕێتەوە و خواردنمان بۆ دەهێنێت، بەڵام ئەو شەوەش تا بەیانی هەر نەهاتەوە، هەموان برسی و توێنی بێهێز و بێزار بووین بەتایبەتی دوو منداڵە کۆچبەرەکە لە برسا هاواریان دەکرد و دەگریان، دەمی منداڵەکانیان دەگرت نەبادا دەنگیان بگاتە دەرەوەی گەوڕەکە و جاسوس شوێنمان بۆ جەندرمە ئاشکرا بکات، بۆنی پاشماوە و جرت وفرتی مشك و مێرولەو دوپشك هەراسانی کردبوین، ناو هۆڵەکە گەرم و تاریك بوو لە دۆزەخ دەچوو، لە سوچێکی گەوڕەکە گرمۆڵەم کردبوو، بێدەنگ و بێهەست وەك ئەوەی ڕۆحم لەبەر نەبێ، لە ناخم دا لەگەڵ دوو منداڵەکە دەگریام، ئەوان کوردستانیان لا دۆزەخ بوو، بۆیە بە جێیانهێشت کەچی قاچاخچیەکە بێ ویستی خۆمان هەمومانی ئاخنیبوە ناو کورەی دۆزەخێکی گەرمتر.

چێشتەنگاوی ڕۆژی دواتر تەقەی دەرگا هات، نەماندەزانی جەندرمەیە یان قاچاخچییەکە یان خاوەن گەوڕەکە، هەموومان لە ناو بارێکی دەروونی شڵەژاودا هەناسەمان دەدا و توڕە و برسی و زەبوون بووین، جگە لەمن هەستی پەشیمان بوونەوە لەهەموویان بەدیدەکرا لەم سەفەرەیان، ئەوەی دەرگای کردەوە قاچاخچییەکە بوو، هەندێکمان ویستمان پەلاماری بدەین و تەمبێی بکەین، بەڵام قاچاخچیەکە دەیان جاری تر خۆی لەو تەون و توڕە بون و هەڵچونانە دەرباز کردبوو بە ئاسانی توانی بەدوو قسەی لوس توڕە بونمان خاو بکاتەوە و وامانتێبگەیەنێ کە لەلایەن جەندرمەوە گیراوە، بۆیە نەیتوانیوە لەکاتی خۆی دا خواردنمان بۆ بهێنێت.

ئێمە لەو دۆزەخە سکی برسیمان دەگوشی قاچاخچیەکەش بەدەم خواردنەوەوە تەماشای سەمای کچانی دەکرد، هەر جارەو چەند هەزار لیرەیەکی دەخستە نێوان مەمکی سەماکەران و دەستی بەسەرو پرچیان دا دەهێنا، تامەزرۆ بوو لە ئامێزیان بگرێت و لە تاریکی شەودا پێیاندا ڕاموسێت، ئەو قاچاخچی بنیادەم بوو.

ئەو کاتە قەناعەتمان هات کە ڕاست دەکات، بەڵام دواتر زانیمان قاچاخچییەکە خەریکی کەیف و خۆشی خۆی بوەو ئێمەی هەر لەبیر نەمابوو.

من لە یاداشتەکانی خۆم دا ناوی ڕێگەی ئەوروپام ناوە ڕێگەی مەرگ و حەیا, مەرگ بەهۆی دەریاو زەریاکان و خراپی یەخت و بەلەمە شەق و شڕەکان، حەیاش بەهۆی چڵێسی قاچاخچیە ساختەچیەکان کە زۆر جار پەنابەرانیان ناچار کردوە کاری سێکسیان لەگەڵ بکەن و کردوویانن بە تاکە مەرجی پەڕینەوەیان، نەجیب کە یاداشتەکانی بە من نیشان دا خەم دایگرتبوو، گوتی: دوای ئەوەی قاچاخچیەکە هەندێ کەلوپەل و زەخیرەی هێنا، داوای لە ژنەکە کرد کە هاوکاری بکات لە چێشتلێنان بەو بیانوەی ژنان باشتر دەزانن چێشت لێبنێن، بەڵام پیاوەکەی ئەم داوایەی ڕەتکردەوە، بەشێك لە هاوڕێکانمان بوونە لایەنگری قاچاخچیەکە بەو پێیەی ئەو نازانێ چێشت دروست بکات, چارەگە کاتژمێرێك دەنگە دەنگ و مشتومڕو گفتوگۆی توند کرا، پیاوەکە دڵی پڕ بوو لەگومان، ناهەقیشی نەبوو، چونکە دەیان چیرۆکی دڵتەزێن و گێچەڵی قاچاخچیەکانی بیستبوو بەژنانی کۆچبەر، بەڵام دوای مشتومڕێکی زۆر ڕازی

بوو بە ناردنی ژنەکەی بەو مەرجەی هەردوو منداڵەکەی لەگەڵ بێت.

ئەو ڕۆژە ژنەکە برنج و فاسۆلیای دروست کردو هەمومانی تێروپڕ کرد، ڕۆژی دواتریش وەك هەمان ڕۆژی پێشوو ژنەکە و هەردوو منداڵەکەی لە گەورەکە چوونە دەرەوە بە مەبەستی ئامادە کردنی خواردن، بەڵام پاش نیو کاتژمێر چیان بینی؟ ژنەکە بەگریانەوە هاتە ژورەوە و دەموچاوی هەردوو منداڵەکە خلتانی خوێن بوو.

پیاوەکەی کە بەم شێوەیە ژن و منداڵەکانی بینی وەك شێتی لێهات، قۆڵی ژن و منداڵەکانی گرت و ڕۆیشتن ئیتر ئەوانمان نەبینیەوە و نەمانزانی بەرەو کوێ سەری خۆیان هەڵگرت، دوای ماوەیەك چاچاخچیەکە لای یەکێك لە پەنابەرەکان ئەم ڕاستیەی درکاندبوو، بۆمان دەرکەوت کە هەوڵی دابوو ژنەکە کاری سەرجێیی لەگەڵ بکات بەڵام ڕازی نەببوو، ئنجا قاچاخچیەکە بە زۆر ئەو کارەی لەگەڵ کردبو و لە ژنەکە و هەردوو منداڵەکەی دابوو.

کاتێك ئەو ڕووداوەم بینی وەك شێتم لێهات، بە ڕوون و ڕاشکاوی داوای هەڵوێست وەرگرتنم لە هاورێکانم کرد و گوتم: دەبێ قاچاخچییەکە تەمبێ بکەین لە تۆڵەی ئەتك کردنی ئەو ژنە بێچارە و قوڕبەسەر و سەرهەڵگرتوە، ئەو سوکایەتیەی بەو ژنە کۆچبەرەی کرد، لای من وەك ئەوە وایە بەهەموومانی کردبێ، بەڵام ئەوان داواکەمیان ڕەتکردەوە، بە بیانوی ئەوەی گەر لێیبدەن بەگرتنیان دەدات و سەفەرەکەیان هەڵدەوەشێتەوە.

دوای دوانزه ڕۆژ لەو گەوره بە لۆریەکی ئاژەڵهەڵگر بەڕێخراین بۆ ئیجە، دوای ئەشکەنجەیەکی زۆری دەروونی گەیشتینە دوورگەی ئەسینا، لەویوەش من بە چەند قۆناغێك گەیشتمە ئەوروپا و داوای پەنابەریم لە وڵاتی فەرەنسا کرد.

(٥)

ڕۆژی دووەمی ناسینی مامۆستا هیوا لەسەر قەرەوێڵەکەم چوارمەشقی دانیشتبووم، خەریکی خوێندنەوەی کتێبێك بووم، هەمیشە بەندییەکان بە شۆخیەوە پێیان دەگوتم ئەوەندە کتێب بخوێنیتەوە یان دەبی بە پرۆفیسۆر یان شێت دەبیت، ئێرەش بەندیخانەیە نەك شێتخانە، بۆیە کار وا بڕوات لێرە جێتنابێتەوە. ئەبوو تەلاڵ بەپێکەنینەوە ڕووی کردە بەندییەکانی تر و گوتی: هەر ئەوە مابوو دەستمان لێبوەشێنێ، لەولا تر ئەبوو حوسێن هەڵیدایێ و بەپێکەنینەوە گوتی: ئیبراهیم و پرۆفیسۆر کوجا مەرحەبا، لەولاتر بەندییەکی تر گوتی: لەئێستاوە پێتان بڵێم من لەگەڵ شێت و مێت دا ناتوانم بژیم دەبێ لێرە دەریبکەن.

کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ تێپەڕیبوو لە پەنجەرە بچووکەکەی سەر دەرگای ژوورەکەمان بانگ کرام: سەودا عەزیز جەبار وەرە دەرەوە لە پرسگە بانگ کراوی، زانیم کێ بانگی کردووم، مامۆستا هیوا و کاکم یاسین دەهاتن بۆ تەواوکردنی گفتوگۆکانمان، دوای تەوقە کردن و بەخێرهێنان کاکم گەڕایەوە بۆ چایخانەکەی و من و مامۆستا هیواش لە هەمان ژووری ڕۆژی پێشو دانیشتین و پێی گوتم: کات درەنگە دەستبکە بەگێڕانەوەی ڕووداوەکان.

لەدەستپێك دا گوتم:

-لە دواین مانگەکانی خوێندنم لەپۆلی نۆ لەخوێندنی ئێواران،

ئیسماعیل منی بردە لای ئەمیری گروپەکەمان کە یەکەم جارم بوو بیبینم، لەوێ ئیسماعیل پاش سڵاو کردن پێی گوت: ئەم مجاهدە قارەمانەم هێناوەتە خزمەتت تا بەیعەتت پێبدات. درێژەی دایێ و گوتی : ماوەی پێنج مانگە هاتۆتە ڕێزی مجاهدینەوە و جێی متمانە و باوەڕی منە، خواپەرستێکی وریا و دڵسۆزە.

ئەمیری گروپەکەمان پیاوێکی کەڵەگەتی موو زەردی تێکچەقاو بوو، ڕیشی بەردابووەوە تا ئاست قرتقرتۆکەی ملی، نیوەی زیاتری تاڵە موەکانی ڕیشی سپی ببوو، جبەیەکی ڕەشی قەترانی عەرەبی بەشانەوە بوو بێ ئەوەی قۆڵی لێ هەڵکێشابێت، لە ژێرەوە جلێکی کوردی پۆشیبوو، مرۆ بە بینینی ترس دایدەگرت، لە قسە کردن توانایەکی باشی هەبوو، لەسەر کورسیە پلاستیکیەکە هەستایە سەرپێ، یەك هەنگاو هاتە پێشەوە و لە شوێنی خۆی چەقی، زەردەخەنەیەکی کرد بێ ئەوەی ببێ بە پێکەنینی تەواو ئنجا گوتی: بارەکەڵڵا بارەکەڵلا .

بەر لەوەی بگەینە خزمەت ئەمیر، ئیسماعیل ئامۆژگاری کردم کە لەکاتی پێشوازی و تەوقە کردن سەر دەستی ماچ بکەم، دوای ئەوەی سەرم چەماندەوەو دەستیم ماچ کرد، بێ ئەوەی قسە بکات تەنها بە ئاماژەی قۆڵ و باسکە بەهێز و گەورەکەی پێی گوتم لەسەر کورسیەکی لای چەپی خۆی دابنیشم.

کە تەوقەی لەگەڵ کردم بەجۆرێك قامکەکانی ڕاگوشیم ئازاری گەیاندە ناو جەرگم، ئەو دەست ڕاگوشینە بەهێزە نامەیەك بوو بۆ من کە تیایدا نووسرابوو ئێمە زۆر بەهێزین، هیچ کاتێك بیر لە هەڵگەڕانەوە یان سەپاندنی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆت

نەکەیتەوە، هەڵبەتە کە کەوتمە بەندیخانە ئنجا ئەم نامە ناڕاستەوخۆیەم پێ خوێندرایەوە و درکم بە ناوەرۆکەکەی کرد نەك پێشتر.

مامۆستا هیوا یەکسەر لێی پرسیم: گەر ئەو کاتە ئەم خوێندنەوەیەت بۆ دەست ڕاگوشینەکەی بکردایە تێکەڵیان دەبووی؟

گوتم:

-هەرگیز نەخێر تێکەڵیان نەدەبووم، ئەزانی ئەوان شەیتانێکی گەورە بوون، بەشبەحاڵی خۆم من درەنگ حەقیقەتی ئەم گروپە و ئەمیرەکەیانم بۆ دەرکەوت، کاتێك لەوە تێگەیشتم کە گورگن کار لەکار ترازابو و نەمدەتوانی پاشەکشە بکەم، چوونکە هەر پاشەکشەیەك بە هەڵگەڕانەوە و دژایەتیان لە قەڵەم دەدرا و دوور نەبوو لەناوببرێم.

مامۆستا هیوا سەری سوڕما، لەبەرخۆیەوە گوتی:

-یانی چی نەتدەتوانی؟

-بەر لەوەی ئەمیر ببینم، ئیسماعیل لە نیوەی ڕێگا پێی گوتم ئێستاش گەر باوەڕت بەوە نیە مرۆڤایەتی لەسەر دەستی ئەمیر و موجاهیدەکانی ڕزگاریان دەبێ، دەتوانی پاشەکشە بکەی و خەریکی ژیانی خۆت بیت بەڵام دواتر ناتوانی، ماوەیەك دوای ئەوە لەوە تێگەیشتم کە ئیسماعیل ڕاستی کرد بەتایبەتی ئەو ڕۆژەی منیان بردە ژێرزەمینێك کە دیمەنی ناوەوەی لە قەسابخانە دەچوو، کاتێك دەرگای ژێرزەمینەکە

کرایەوە چیم بینی؟ سێ کەسی دەموچاو هەڵپێچراو بەدەست و شمشێرەوە لەناو چەندین لاشەی پەلپەل کراو دەسوڕانەوە، سێ شمشێر بەدەستەکە لە شێوەی قەساب قۆڵ و باسکی خۆیان هەڵماڵیبوو، خەریکی پەلپەل کردنی لاشەی کوژراوەکان بوون، لەملا هەشت نۆ ڕان و قۆڵ و لەولا چوار پێنج کەللە سەرو لەولاتر گەدە و گیپاڵ و کەلووپاچەی تری کوژراوەکان فڕێدرابوون، ژێر زەمینەکە یەکپارچە گۆمی خوێن بوو، کاتێك ئەم دیمەنەم بینی خەریك بوو لەهۆش خۆم بچم و هەناسەم بوەستێ هێندە ترسام، ترس و فۆبیا بەشێوەیەك هۆش و هەستی بردم تا ئەو ئاستەی ئەو دیمەنە ترسناکانە بە خەون بزانم و گەر ئیسماعیل نەبوایە هەر لەوێ دەکەوتم و کۆتایی بە ژیانم دەهات، بەر چاوم تاریك بوو، دەست و لاقم کەوتنە لەرزین بەشێوەیەك کە نەتوانم خۆڕاگرم، ئیسماعیل بە چپەوە پێی گوتم: ترسنۆك ئەوە چیە بۆ واتلێهات؟ لێوم تەتەڵەی دەکرد، بە ترسەوە لەبەرخۆوە گوتم: خوایە گیان ئەی تۆ ساحێبی ئەمانە نیت؟ ئەمانە بۆ کوژراون و بۆچی وەك مەڕ و مانگا پەلپەل کراون خۆ گۆشتی خێر دابەش ناکەن؟

هەمان ئەو ڕۆژە گەنجێکیان لە ژێرزەمینی خانوەکە بەشێوەیەکی نامرۆڤانە سەربڕی و پارچە پارچەیان کرد و خستیانە ژێر گڵ.

-لەسەر چی کوشتیان؟

-منیش لە ئیسماعیلم پرسی بۆ کوشتتان؟ گوتی: چوونکە وازیهێنابوو دەیویست ئاشکرامان بکات. گوتم: بەڵام بۆ بە گوللە نەتانکوشت؟ ئەدی بۆچی پەلپەلتان کرد؟ گوتی سەربڕین

شەرعییە بۆ ئەوانەی لە ئاینی ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە هەروەها بۆ ئەوەی دوای بزر بوونی، هێزە ئەمنییەکان و کەسوکاری تەرمەکەی نەدۆزنەوە و گومان لە ئێمە نەکەن.

گوتم : ئەو قەسابخانەیە چی بوو؟

گوتی: ئەوانە لەو فیرقانە بوون کە خودا بێبەشی کردوون لە بەهەشت.

ئەو کاتە لە ناخمدا گوومان چەکەرەی کرد، گومان لەسەرتاپای بیرکردنەوە و ئامانجەکانیان، بەڵام دورکەوتنەوە و وازهێنان دادی نەدەدام، پێدەچوو نیشاندانی ئەو قەسابخانەیە و کوشتن و پەلپەلکردنی جەستەی ئەو گەنجە لەبەرچاوی من و دوانی تر بۆ ئەوە بوبێ کە نەتوانین پاشەکشە بکەین لە ئەندام بوون لەو گروپە و هەڵگەڕانەوە لێیان، هەروەها ڕاهێنانی ئێمەش بووبێ تا لەوەودوا کاری وامان پێبسپێرن و نەترسین و گوێڕایەڵیان بین.

لە نزیك ئەمیر لەسەر کورسییەکە گرمۆڵە ببووم لەکەسێکی دیلکراو دەچووم، ترس لە هەیبەتی ئەمیر و ترس لەوەی لە قسەکردن هەڵە نەکەم و دەسنوێژم لە گروپکاری و توندڕەوی نەشکێ ئەو بارودۆخەی بۆ خولقاندبووم کە شەرمن و ترسنۆك و بچووك دەرکەوم لەسەر کورسیەکە، دڵم خێرا خێرا لێی دەداو کەمێك ترس و شێواویم بەسەردا زاڵ بوو، دەمویست وا خۆم دەربخەم کە هیچ گرفتێکم نیە، ئەو شوێنەی ئەمیری لێ بوو ماڵی خۆی نەبوو، بەڵکو خانویەکی گەورەی دوو نهۆم بوو کەوتبوە ناو باخێکی گەورەوە کە پڕ بوو لە درەختی

هەمەچەشن لە دەرەوەی شار، لەوێوە سەرپەرشتی ڕێکخستنە نهێنی و هێزە چەکدارەکانی دەکرد، چەند چرکەیەك بێدەنگی باڵی کێشا بە ژوورەکەدا، ئنجا ئەمیر گوتی : گەنجۆ کارت چیە؟ منیش یەکسەر بێوەستانەوە گوتم: لە کارگەی دروست کردنی چپس کار دەکەم و ئێوارانیش خوێندکارم.

-خوێندکار؟

هێندە بە سەرسوڕمانەوە وای گوت هەستی ئەوەی لا دروست کردم کە خوێندن چ کەڵکێکی نیە و بە خۆم بڵێم بۆچی بخوێنم؟ هەرواش دەرچو، ئەمیر گوتی: جا گەنجۆ کێ بە خوێندن گەیشتۆتە بەهەشت تا تۆ بگەی؟

بەو دەبڕینەی « هیواکانمی گوشی، تا ئەو ئاستەی هیچ هەنگاوێکی ژیان بە پێویست نەزانم جگە لە تێکۆشین بۆ گەیشتن بە بەهەشت، مرۆ دەبێ بۆ گەیشتن بە بەهەشت خەڵك بکوژێت و ئەتکیان بکات و دەسبەرداری ماڵ و منداڵ و ژیانی خۆی بێ و وەك دڕندەیەك دەرکەوێ، بۆ گەیشتن بە بەهەشت نەخوێنێ و هۆشیار نەبێ و لە هیچ تێنەگات و زۆر گوێڕایەڵ بێت و هیچ بیرنەکاتەوە، تاکو چەپ و ڕاستی خۆی پێ جیانەکرێتەوە.

ئەمیر دەیڕوانیە سەروسیماو جلوبەرگم، هەر قسەیەکم بکردایە بە دڵ گوێی لێمدەگرت، وا هەستم دەکرد بە فەرمانی خۆی برابمە لای، نەك لەسەر پێشنیازی ئیسماعیل تاکو لە بینین و نیەت و نرخ و سەنگم تێبگات و بزانێت دەشێم بۆ کارکردن لەگەڵیان یان نا؟ ئەمیر لێی پرسیم: لە کاروبار و ژیانی خۆت

ڕازیت؟ لەکاری ئەو کارگەیەی کاری تیادەکەی ئاسوودەی؟

ئەو زانیاری وردی لەسەر من هەبوو، بەوەڕا دەمزانی سەرەتای کارکردنم لەو کارگەیە زۆر بە نارەحەتی بردە سەر تا ڕاهاتم، ئەو دەیزانی نارەحەت بووم بۆیەش ئەو پرسیارەی لێکردم، گوتم: ژیانم مام ناوەندییە، بەڵام پەیوەندیم پچڕاوە لەگەڵ هەموو خزمەکانم، هەروەها لە سەرەتای کارکردنم لە کارگەکە زۆر ئاسودە نەبووم، بەڵام ئێستا ڕاهاتووم.

-ئافەرم گەنجۆ کە پەیوەندیت پچڕاندوە لەگەڵ خزمەکانت چونکە ئەوان بۆ خۆیان دەژین نەك بۆ ڕازی کردنی خودا، دەبێ ئەوەش بزانی تەنها پچڕاندنی پەیوەندی بەس نیە پێویستە دەرهەقیان هەنگاوی تریش بهاوێی وەك ئەوەی ئێمە لەگەڵ خزمەکانمان کردمان، پێغەمەری خوا عەلەیهی سەلام هەموو ئەو خزمانەی پشتگوێ خست کە نەدەهاتنە ژێر ئاڵای ئیسلام، پێویستە تۆش سەحابەی ڕێگای پێغەمبەر بیت، سەحابە بونیش تەنها بە قسە نابێ، خوای گەورە کردەوەی لێمان دەوێت، بزانە خوای گەورە ئەرکێکی گرنگی خستۆتە سەر شانمان ئەویش ئەوەیە هەموو کۆمەڵگە بکەین بە مجاهید و تێبکۆشن بۆ بەرز ڕاگرتنی ئاڵای ئیسلام و دوور خستەوەیان لە فەساد و ئاژاوە و هەموو ئەو کار و ڕفتارانەی خوا پێی ناخۆشە، ئەم وەزعەی ئێستا پێویستی بە جیهادە دژ بەوانەی خەریکی بڵاوکردنەوەی کوفر و ئیلحادن، پێویستە هەمو ڕێگایەك ( تەنانەت گەر پێویستی کرد ڕێگای کوشتنیشیان ) تاقیبکەینەوە بۆ ملکەچ کردن و هێنانیان بۆ ژێر ئاڵای ئیسلام و پابەند کردنیان بە یاسا و حوکمەکانی خوا .

دوای گفتوگۆیەکی بیست دەقیقەیی و چای خواردنەوەیەك بە تەوقەکردنێکی تری توند ماڵئاواییم لێکرد، دوایین قسەی بۆ ئیسماعیل بەچرپەوە ئەوە بوو گوتی: فێری بکە چۆن بێ بە باز تا کوندەپەپۆ ڕاو بکات، ئەویش بە زەردەخەنەوە گوتی: قوربان خەمت نەبێ خەریکە بێ بە بازێکی هەڵکەوتوو، دەبوو ئەوسا بمزانیایە ئەوان دەیانەوێ ڕاویان بۆ بکەم نەك خواپەرستی.

دوای گەڕانەوەم هەم دڵخۆش بووم هەم نائارام و هەناسەسوار، ترسم لەوە هەبوو بمکەن بەباز بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکانی خۆیان، هەرچۆنێك بێت ئەو شەوە لەناو تەمی گومان و ترس و دڵەڕاوکێ کاتم بردە سەر، دڵم گیرابوو، هیچم پێنەدەخورا، خەوم زڕابوو، تەنگەتاو و ناحەز دەردەکەوتم.

لە پێنج مانگی ڕابردووی پەیوەندییەکانم ئیسماعیل زۆر دیوی شاراوەی ئاینی ئیسلام و مەرجەکانی خواپەرستی و چۆنیەتی خواناسین و بنەما چەسپاوەکانی ئاین و ناسینی ئاینەکانی تری بۆ باس کردبووم. پێی گوتم ئۆمەتی محەمەد حەفتاو سێ فیرقەن، تەنها فیرقەیەکیان ڕێی خوایان ون نەکردوە، دەبێ تۆ لە نێوان ئەم هەمو فیرقەیە دۆش دانەمێنی و کاروانی فیرقە خواناسەکە بدۆزیتەوە و ببی بە یەکێك لەم فیرقەیە و وەك ئەوان ڕفتار و هەڵسوکەوت بکەیت و وەك ئەوان خوا بپەرستی نەك بە تێگەیشتنی خۆت.

دوای ئەوەی ئەمیر پێی گوتم بەهەشت بەخوێندن بەدەست نایە، دەستم لە خوێندن هەڵگرت، گەرچی خوێندکارێکی باشیش بووم بەوە دڵی باوك و دایکمم ڕەنجاند، ئەوان هەمیشە پێیان دەگوتم: تۆ خەمێکی گەورەت خستۆتە دڵمان، لە جیاتی

ئەوەی دڵمان خۆشبکەی بویتە مایەی سەرئێشە بۆمان، لەجیاتی ئەوەی کارئاسانیمان بۆ بکەی و ئەرکی سەرشانمان کەم بکەیتەوە ئەرکی سەرشانمانت گرانتر کردوە، زۆر جار دایکم بە دەم گریانەوە دەیگوت: نابێ خواپەرستی کوێرت بکات لە بینینی ڕاستییەکانی ژیان و پشتگوێ خستنی دایك و باوك و ماڵ و منداڵت، دەزانی ئیبراهیم هەردوو کوڕەکەت وەك هەتیو وان؟ نە قسەی خۆشیان بۆ دەکرێ نە نازیان هەڵدەگیرێ نە خێزانەکەت دڵخۆشە نە ئێمەش.

دەمویست دڵی ڕەنجاوی دایکم و باوکم چاك بکەمەوە بەڵام هەمیشە ئیسماعیل پاشگەزی دەکردمەوە و دەیپرسی : بەهەشت گرنگترە یان باوك و دایك ؟ ئینجا دەیگوت: ئەم ڕێگایەی ئێمە ڕێگای پەیامبەر و سەحابە و خەلیفە و پیاوچاکانیەتی، خۆ ناکرێ بۆ دایك و باوکێك کە ڕێگەی چەوتیان گرتۆتە بەر دەسبەرداری ڕێگای خوا و پەیامبەرەکەی و بەهەشت بین. ئەبوو حەنیفەش هەمان قسەی ئیسماعیلی دووبارە دەکردەوە، بەڵام بە جۆرێکی تر، ئەو دەیگوت: نابێ سۆز بۆ دایك و باوك ڕێگای خودات پێ بەربدات و بتبەنەوە بۆ سەردەمی جەهالەتی جارانت، بەڵکو دەبێ تۆ ئەوان بگۆڕی نەك ئەوان تۆ بگۆڕن.

دەبوو هەفتەی جارێك یان دوو جار سەردانی ئەمیر بکەین و ڕاسپاردە و فەرمودەی تازەمان پێبڵێت، داوای لێ دەکردین زۆرترین کەسی فیرقەکانی تر کە هەڵگەڕاونەتەوە لە ئاینی خودا بهێنینەوە ڕێزی مجاهدین، ئیسماعیل دەیگوت : دەبێت ڕاسپاردە و قسەکانی ئەمیر و ئەبوو حەنیفە وەك ناوی خۆت لەبەرت بن، لە دوای قورئان لە لات پیرۆزترین قسە بن،

دەیگوت : دەبێ بزانی کام فەرمان و بڕیاری بۆ تۆیە کامەشیان بۆ هاوڕێکانی ترمانە، نابێ لێت تێکبچێت و کاری مجاهیدێکی تر ڕاپەڕێنی ئەگەر پێت نەگوترا، کاری تۆ لەم قۆناغە تەنها گوێڕایەڵی و ناسینەوەی ئایەت و حەدیس و فەرمودەکان و جیا کردنەوەیانە لەو حەدیسانەی منافیقەکان بۆ مەبەستی خۆیان دایانتاشیوە.

هەفتەیەك دوای دیداری ئەمیر، ئیسماعیل پێی گوتم: پێویستە سەردانی ئەبوو حەنیفە بکەین، پرسیم هەر سەردانێکی ئاساییە؟ گوتی: نازانم، ئەبوو حەنیفە داوای کردوە سەردانی بکەین، عەسرێکی زووی هەمان ڕۆژ لەگەڵ ئیسماعیل بەرەو لای ئەبوو حەنیفە بەڕێکەوتین، وامزانی دەچینە ماڵی خۆیان، کەچی چووینە ناو خانویەکی تر کە ئەویش لە دەرەوەی شار بوو، ئەو ژورەی لێی دانیشتبوو سێ بە چوار دیار بوو، تاخم قەنەفەیەکی بچوکی تیا دانرابوو لەگەڵ کورسی و مێزێکی بچوك، لەپشتی ئەو شوێنەی لێی دانیشتبوو وێنەی پیاوێکی بەویقار هەڵواسرابوو کە شمشێرێکی دوودەمی بەدەستەوە بوو، وێنەکە خەیاڵی بوو نەك وێنەی کەسێك، دوای سەلام و دانیشتن و بەخێرهێنان ئەبوو حەنیفە گوتی دەبێ تراش بکەی، سەرم سوڕما، ئاخر ئەوان ڕیش هێشتنەوەیان بە فەرز دەزانی، کەچی داوای لێکردم ڕیشم بتاشم.

پرسیم بۆچی ڕیشم بتراشم ئەی گوناحبار نابم؟ گوتی کاتێ گوناحبار دەبیت بۆ خۆجوان کردن تراش بکەیت، هەرچی ئەوەی تۆیە ئەرکێکت پێ دەسپێرین، بۆ ئەم ئەرکە پێویست دەکات ڕیشت نەبێ تا گومانت نەخرێتە سەر.

دڵم بە شێوەیەکی ناسورشتی کەوتە لێدان، دەبێ چ ئەرکێکم پێبسپێرن؟ تا گەیشتمەوە ماڵی خۆمان سەد جار زیاتر ئەم پرسیارەم لە خۆم کرد.

دوای ئەوەی تراشم کرد سارا و دایك و باوکم بە بینینم دڵخۆش بون، وایانزانی ئیدی لەو ڕاستیانە تێگەیشتووم کە هەمیشە پێیان دەگوتم بە ڕیش نیە بە ئیشە، نەیاندەزانی مەرامێك لە پشتی تراش کردنەکەم هەیە، نەك ئەوەی بۆچونم گۆڕابێ و وازم لەو گروپە هێنابێ.

دوای پانزە ڕۆژ لەگەڵ ئیسماعیلی هاوڕێم لە هەمان شوێن سەردانی ئەبووحەنیفەمان کردەوە، بە بینینم دڵخۆش بوو، پێی گوتم ڕوخسار و شێوەت بۆ کارەکەمان دەقی گرتوە و گونجاوە.

لەدڵی خۆم دا دەمگوت:

-خوایە گیان دەبێ چ کارێك بێت؟

زۆر دوودڵ بووم، پرسیم کارەکە چیە؟ گوتی سبەی شەو کاتژمێر چواری بەیانی لێرە ئامادەبە، ئەرکەکەت بۆ ڕوون دەکەمەوە.

هەموو گیانم کەوتنە ئارەقە دەردان و ترسێکی زۆر دایگرتم، وا هەستم دەکرد بەرەو مردن هەنگاو دەنێم، ئەو چەند کاتژمێرەی مابوو بۆ وادەی دیاریکراو، لە ناو بارێکی دەروونی ئاڵۆز و نارەحەت دا بردمە سەر، هەمیشە بیرکردنەوەم لای ئەبوو حەنیفە و ئەو کارە بوو کە پێمدەسپێرن، بیرم بۆ ئەوە دەچوو کەسێکم پێبکوژن، یان کەسێکیان بۆ بڕفێنم، ئاخۆ ئەو کارەم

پێ ئەنجام دەدرێت و سەرکەوتو دەبم؟ چیم بەسەر دێت؟ هەمیشە ئەم دوو پرسیارەم لە خۆم دەکرد.

کاتژمێر چواری بەیانی بێ ئەوەی بهێڵم سارا و هەردوو منداڵەکەم بە خەبەر بێن، خۆم گۆڕی و لەگەڵ ئیسماعیل کەوتینە ڕێ، لە هەمان شوێنی پێشوو ئامادە بووین، لە ژوورەکەی ئەبوو حەنیفە دوو گەنجی سەرووی بیست ساڵە بەناوی ئەبوو بەسیر و ئەبوو عومەر دانیشتبوون دیار بوو ئەوانیش ڕیشیان پێ تاشرابوو وەك من لە چاوەڕوانی دا بوون.

ئەبوو حەنیفە چوار ژنی هەبوو هەمیشە دەیگوت ژن هێنان سوونەتە، گەر بۆی بلوایە بیست ژنی دەهێنا، ژنی یەکەم خزمی خۆی بوو، تەمەنی چەند ساڵێك لە خۆی گەورەتر بو، وا دەهاتە بەرچاو کە پەیوەندیە خێزانیەکانیان ئەو ژنەی بەسەردا سەپاندبێ، دڵی پێنەدەکرایەوە و لە ژیان و گوزەران و بەخێوکردنیش پشتگوێی خستبوو، سێ ژنەکەی تری لەوانە بوون کە کەسوکاریان لە ڕێزی مجاهیدین و گروپەکەمان بوون و پێشکەشی کرابوون.

ژنی دووەمی ناوی سەفیە بوو کە خۆی بە پەری ناوی دەبرد، تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵ بوو، زیاتر لە هاوسەرەکانی تری خۆشیدەویست و گرنگی پێدەدا و هەڵسووکەوتی لەگەڵ دەکرد و نازی پێدەدا، سەفیە بە ڕووخسار و قەد و باڵا ئێجگار شۆخ و شەنگ و جوان بوو کە هاوشێوەی کەم بێت، خۆشەویستی لە ڕادە بەدەری ئەبوو حەنیفە بۆ سەفیە گەیشتبوە ئاستی دڵ پیسی و چاودێری کردنی، لەبەر ئەوەی تەمەنیان تا ڕادەیەك دوور بوو لەیەکترەوە لەوە دەترسا سەفیە تووشی لادان

بێت، هەر بۆیەش خوشکەزایەکی خۆی کە ناوی سامان بوو بە مووچەیەکی مانگانە لای سەفیەی دانا بەو مەبەستەی کاروباری بازاڕ و کڕینی پێداویستیەکانی بۆ ڕاهی بکات، مەبەستی سەرەکی ئەبوو حەنیفە لە دانانی سامان لەماڵەکەی، ئەوە بوو ئەو کاتانەی کە خۆی لەماڵ نەبێت و سەرقاڵ بێت بە کاروباری ڕێکخراوەکەوە، سەفیە لەژێر چاودێری سامان دا بێت و بواری چوونە دەرەوە و دروستکردنی پەیوەندی نەبێت بە خەڵکی ترەوە، ئەمەش دانانی چاودێرێکی مەحرەم بوو بەسەر سەفیەوە، بەڵام ڕووداوەکان بەپێچەوانەی حەز و تێگەیشتنەکانی ئەبوو حەنیفە گوزەریان کرد، بەو هۆیەی سامانی خوشکەزای ئەبوو حەنیفە بەردەوام لەو ماڵە بوو جوانی و شۆخ و شەنگی سەفیە سەرنجی ڕاکێشا، ڕۆژانە سەفیەی دەبینی بە جلی نیمچە ڕووتەوە لە خۆشۆر دەهاتە دەرەوە، یان لەبەر ئاوێنە خەریکی جوان کردنی خۆی و ڕێکخستنی پرچی بوو، سەرەتا سەفیە لەو ڕوانگەیەی مارەیی لە سامان نایەت بەشێوەی ئاسایی و بێ مەبەست لەشولاری دانەدەپۆشی و زۆربەی سینگ و مەمکی دیار بوون، بەڵام دواتر بە مەبەست ماکسیەکەی بەرز دەکردەوە بۆ ئەوەی ڕانی بەدەربکەوێت، یەخەی ماکسیەکەی واڵا دەکرد تاکوو مەمکی دەربکەوێت، تەنانەت داوای لە سامان دەکرد شان و مل و ڕانی بشێلێت، دەیویست ئارەزوەکانی بورژێنێت و دەستی بۆ ببات و سەرنجی بخاتە سەر شوێنە هەستیارەکانی جەستەی. لە سەرەتادا سامانیش خۆی وەك بێئاگا و بێ مەبەست نیشان دەدا، دەستی بەسینگ و ژێر باڵی و مەمکی دا دەهێنا، لەسەرخۆ پووز و ڕانی دەشێلا، تەنانەت لەسەرخۆ دەستی دەگەیاندە هەستیارترین

شوێنی جەستەی، سەفیە لەبەردەستی ڕادەکشا هەر جارەو شوێنێکی جەستەی پێ دەشێلا، گفتوگۆکانیان هەست بزوێن بوون.

زۆر جار سەفیە خۆی لەقەدی سامان دەخشاند و هەندێك جاریش وەك کەسێکی مەحرەم لێوی دەگەیاندە سەر لێوی سامان و ماچی دەکرد، سامانیش هەمان ڕەفتاری دووبارە دەکردەوە و دەمی سەفیەی دەمژی، سینگ و مەمك و ڕانی سەفیە هێندە سەرنج ڕاکێش بوون سامانی مەست کرد بوو، بەجۆرێك شەیدای ببوو ئیتر بەبێدەنگی لەمەمك و لەشولاری ڕانەمینێ و مەبەستەکانی خۆی بۆ ئاشکرا بکات و تێیبگەیەنێت کە خۆشیدەوێ، هێواش هێواش لەیەکتر نزیك کەوتنەوە، ئیدی لەبارەی خۆشەویستیەوە گفتوگۆیان دەکرد و ڕایان دەگۆڕیەوە، هەڵسووکەوتی ڕۆژانەی سامان و سەفیە گەیشتە درکاندنی مەبەستەکانیان و گەیاندنیان بە یەکتر، هەروەها گەیشتە خۆشەویستی تەواو و ئاوێتە بوون و پێکەوە نووستن و جووت بوونیان.

خۆشەویستی نێوانیان بەشێوەی خێرا پەرەی سەند، هەموو ڕۆژێك تام و چێژی یەکتریان دەکرد، بەشێوەیەك ئاوێتە ببوون کە هیچ هێزێك نەتوانێت پێشیان لێبگرێت و لە یەکتریان جوێ بکاتەوە، هەردووکیان بەڵێنیان دایە یەکتر دوای لەناوبردنی ئەبوو حەنیفە ڕوەو ئەورووپا بڕۆن و لەوێ خێزان پێکەوە بنێن.

ئەبوو حەنیفە لەم هەموو جمووجۆڵ و هەڵسووکەوتە نائاساییانەی سامان و سەفیە کەوتبوە گومان، گومان لەوەی پەیوەندی خۆشەویستیان هەبێت، خەیاڵی بۆ ئەوە دەچوو

ڕۆژێك كە دێتەوە ماڵ سامان و سەفیە لەماڵ نەماون، ڕۆیشتوون بۆ شوێنێكی نادیار.

عەسرانێك ئەبوو حەنیفە بەو كلیلەی بەنهێنی دروستی كردبوو دەرگای حەوشەی كردەوە، مەبەستی بوو گومانەكانی بەلادا بخات، ئەوەی ئەو عەسرە بینی گومانەكانی زیاتر كرد، لەژووری دانیشتن سەفیەی بەنیمچە ڕووتی بینی خەریكی لەبەر كردنی ستیان و جلی تری ژێرەوە بوو، كە سامان لە بازاڕ بۆی هێنابوو، سامانیش لەژێر جێگەدا خۆی مات دابوو، ئەبوو حەنیفە وا هەستی كرد سامان گوێی لە ترپەی پێی بوبێت بۆیە چووبێتە ژێر جێگا، خۆی كردبێت بە خەوتوو، بەڵام ئەبوو حەنیفە نەك هەر گومانەكانی بەتاڵ نەبووەوە بەو خەو لەخۆخستنە بەڵكو گومانەكانی پتر بوون.

سەفیە بە شپرزەییەوە هەندێك خۆی كۆكردەوە و ماكسیەكەی خستەوە بەری، ئەبوو حەنیفە تەماشای سەفیەی دەكرد وەك ئەوەی پێی بڵێ: بۆچی لەو ژوورەی سامانی لێیە خۆت ڕووت كردۆتەوە؟ بێ ئەوەی ئەم پرسیارەی لێبكات، سەفیە بەدەم خۆلەبەركردنەوەوە گوتی: ئەوە سامان خەوتبوو بۆیە لێرە ئەم جلە نوێیانەم تاقیكردەوە.

ئەبوو حەنیفە بێ هیچ هەڵچوونێك پێی گوت:

-جا بۆ لەژووری نووستن نا ؟

-كە نووست لام ئاسایی بوو، جلەكانیش لێرە بوون بۆیە.

ئەبوو حەنیفەش بەزەردەخەنەیەكی خەماوی و بارگاوی بە

ڕق و تورەییەکی پەنگخواردوو، بێ خۆتوڕە نیشان دان گوتی: کێشە نیە.

بەڵام سەفیە باش دەیزانی زەردەخەنەکەی پڕ بوو لە ڕق و گومان.

ئەبوو حەنیفە نەك هەر گومانەکانی نەڕەوینەوە بگرە مکوڕتری کرد لەسەر ئەو قەناعەتەی کە سەفیە لەگەڵ خوشکەزاکەی پەیوەندی سۆزداری هەیە بەڵام بێدەنگی هەڵبژارد، لەوە دەچوو کاری بەو بێدەنگیە بوبێ.

گومانەکانی ئەبووحەنیفە تا دەهات زیادی دەکردو دەبون بە بەڵگە، بۆ ئەوەی بەڵگەکانیش بکات بە بەڵگەی تۆمارکراو بە نهێنی کامێرای چاودێری لەناو هەموو ژوورەکان چاند بێئەوەی بهێڵێ سەفیە بەم کارە بزانێ، تا دواجار پاش مانگێك لەو ڕووداوە تەواوی گرتەی کامێراکانی خستە سەر شاشەی مۆبایلەکەی و هەموو خەوتنەکانی سەفیەی لەگەڵ خوشکەزاکەی بینی و فتوای کوشتن و لەناوبردنی هەردووکیانی دەرکرد.

****************

من و ئیسماعیل و ئەبوو بەسیر و ئەبوو عومەر دانیشتین و کەوتینە حاڵەتی چاوەڕوانی و گوێگرتن، ئەبوو حەنیفە بەم شێوەیە دەستی کرد بە قسان:

وەکو خۆتان دەزانن ئێمە مسوڵمانین و خودا کۆمەڵێك واجبی لەسەرمان فەرز کردوە هەر لە نوێژ و تاعەت و حەج و زەکات و بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام تا دەگاتە سزادانی هەموو ئەوانەی شەریك پەیدا دەکەن و دەبنە هۆی بڵاوکردنەوەی بێباوەڕی و بەرەڵڵایی و فاحیشە و دزی، واجبێکی ئایینیە هەموو ئەوانە لەناو ببەین کە دەیانەوێ ئاینی ئیسلام لاواز بکەن و خزمەتی سەهیۆنیەتی پێبکەن، کوشتنیان فەرزە و هەر مسوڵمان و موجاهیدێك بەو ئەرکەوە هەستێت لای خوای گەورە پایەیەکی بەرزی دەبێت و لە بەهەشت شادومانی دەکات، ئێمەش بە پێویست و واجبێکی ئاینی دەزانین کە دەست لە تاغووتەکان بوەشێنین، بۆ ئەمەش بەرنامە و پلانێکی تۆکمەمان دارشتوە و هەر یەکێك لە ئێوە لەم واجبە ئاینیە بەشدار دەبێت، دڵنیام خودای گەورە لەتۆماری چاکەکاران ئەم چاکە و خێرەتان بۆ تۆمار دەکات.

باش گوێبگرن: ئەبوو عومەر ئەرکی ئەوەیە کاتژمێر پێنجی بەیانی جلی کرێکارانی شارەوانی لەبەر بکات و پاشماوەکانی سەر شەقامەکە کۆ بکاتەوە و بیانخاتە ناو بەرمیلێك کە خۆمان لە شوێنێکی گونجاو دایدەنێین، دوای ئەوەی ئەبوو عومەر شوێنەکە بەجێدەهێڵێت و دەگەڕێتەوە لای کەسی دووەم کە ئیسماعیلە، بەرمیلەکە لە سوچی سەرەوەی شەقامی باتە دادەنرێت، ئەبوو عومەر و ئیسماعیلیش لەوبەری شەقامەکەوە

دەوەستن و چاودێری دەوروبەری بازاڕەکە و جموجۆڵی خەڵک و هێزە ئەمنیەکان دەکەن، ئۆتۆمبیلێکتان بۆ تەرخان کراوە بۆ ئەوەی کاتێک ئەرکەکەتان تەواو بوو بتانگەیەنێتەوە لای ئێمە، ئەرکی ئەبوو جەعفەر ئەوەیە نیو کیلۆ ( تی ئێن تی ) کە لەناو کیسەیەکی نایلۆن دانراوە بخاتە ناو بەرمیلەکەوە بێئەوەی هیچ کەسێك هەستی پێبکات، دوای ئەوە دەستبەجێ بەرەو لای ئۆتۆمبیلەکە بڕوات و لەگەڵ ئەبوو عومەر و ئیسماعیل لەو شوێنە دوورتان بخاتەوە.

ئەبوو بەسیر لەسەرەوەی قەڵات لەسەر دیواری خانووی ئامازەپێدراو لەو کاتەی بڕیاری پێدەدرێ بەکۆنترۆڵێك کە بۆی دابین کراوە ( تی ئێن تی ) ەیەکە دەتەقێنێتەوە، کەسێکی تریش بە کامێرا وێنەی تەواوی کردەوەکە دەگرێت و بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە و شریتی ڤیدیۆکەمان تەسلیم دەکات، بزانن: کەس ئەرکی کەسێکی ترتان جێبەجێ ناکات و هەرکەسەو کاری خۆی دەکات.

لەوە دەچوو ڕەنگ و ڕوخسارم تێکچوبێت بۆیە ئەبوو حەنیفە لێی پرسیم: ها ئەبوو جەعفەر خۆ ناترسی؟ بە شپرزەییەوە گوتم: نا نا ناترسم، لەخۆم بەگومان بووم لە شێوەی پرسیار گوتم: جا لەچی بترسم؟ لێوم تەتەڵەی دەکرد و شپرزەییم پێوە دیار بوو، یەکەم جارم بوو کارێکی وەها گرانم پێ بسپێردرێت.

مامۆستا هیوا هەردوو دەستی خستبوە ژێر چەناگەی، چاوی بڕیبوە ناو چاوم، پرسی: خۆ بەو بەیانی زووە بەرپرسان نەدەهاتنە شەقامی باتە تا بیانکوژن، ئەوەی لەو کردەیە دەکوژرا خەڵکی کاسبکار و دوکاندار و دەستگێڕ و کڕیار و مشتەریەکان

بوون، ئایا لەو چرکەیەی ئەبوو حەنیفە ئەرکەکەی پێ سپاردن بیرت لەوە نەکردەوە ئەوەی دەکوژرێ هاوڵاتیانن نەك کاربەدەستان؟

گوتم:

-بەڵێ هەمان پرسیارم لەخۆم کرد، باش دەمزانی ئەوانەی لەو کردەیە دەکوژرێن بەرپرسە باڵاکانی وڵات نین، ئەوان وایانتێگەیاندین زۆربنەی هاوڵاتیانی شار چ جیاوازیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ کاربەدەستان نیە چوونکە دەنگیان پێدەدەن و هاوکارن بۆ درێژەدان بەم حوکم و زوڵمەی هەیە، بۆیە کوشتنی ئەوانیش حەڵاڵە، جگە لەوەش ئەبوو حەنیفە گوتی ئێمە دوو ئامانجمان لەم کردەیە هەیە، یەکەم: کوشتنی هەرکەسێك کە لایەنگری حکومەتە و لە ژێر سایەیان دەژین و پێیان ڕازین، دووەم: نانەوەی پشێوی، تا وڵاتانی جیهان ئەوە بزانن کە لەهەرێمی کوردستان ناڕەزایەتی هەیە و خەڵکانێك هەن دژی ئەم حکومەتە و دژی ئەم سیستەم و ستەمەن کە لەمسوڵمانان دەکرێت.

دیسانەوە مامۆستا هیوا لێی پرسیم: ئەی کوشتنی مرۆڤ تاوان نیە؟ ئەی نەتدەزانی ئەوەی دەسەڵاتی ڕەهای سزادانی کەسە بێباوەڕ و خراپەکانی هەیە تەنها خودایە و دۆزەخیشی بۆ ئەوە دروستکردوە، ئایا بیرت لەوە نەکردبوەوە ئێوە لە جیاتی خودا سزا دەسەپێنن، کوا لە کام دەق خواناسان سەرپشك کراون لە سزادانی ئەوانەی خوا ناناسن؟ لەهەمووی گرنگتر ئەو پرسیارەیە ئایا حکومەت ئازادی ئاینی لە خەڵك سەندبوەوە یان باشتر بڵێم ئایا کەس لە خواپەرستی مەنع کرابوو؟

پرسیارێکی تریشم لا دروست بوو، گەر بۆ ئەو کردەوەیە خوای گەورە پاداشتی دانابێت بۆچی ئەبوو حەنیفە خۆی بەشداری ڕاستەوخۆی کردەوەکەی نەکرد تا لەو خێر و پاداشتە بەشی هەبێت؟

-بەشێك لەو ترسەی گیانی تەنیبوومەوە ئەوە بوو کە لە جیاتی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدەین، چوونکە کوشتنی خوانەناسیش فەرز نەکراوە لەسەر مسوڵمانان، بەڵام نازانم بۆ نەمتوانی ئەو تاوانە ئەنجام نەدەم؟

بەر لەهەتاو کەوتن، هەمومان براینە شوێنی دیاریکراو، هەریەکەمان کاری خۆمان ڕاپەڕاند، نزیك دوو کاتژمێر دوای گەڕانەوەم بۆ خانوەکەی ئەبوو حەنیفە لە تەلەفزیۆنەکانەوە هەواڵی تەقینەوەیەك لە شەقامی باتە و کوژرانی هاوڵاتییەك و بریندار بوونی سێی تر بڵاو بویەوە.

مامۆستا هیوا گوتی: ئیبراهیم ئێستا وا دێتەوە بیرم کە ئەوەی لەو کردەوەیە کوژرا کێ بوو، ئایا دوای کردەوەکەتان زانیت کێتان کوشت؟

-نا نەمزانی و نەمدەناسی.

-ئەوەی کوژرا ناوی محەمەد بوو، لە گەڕەکی سەیداوە لە ژوور و هەیوانێك دەژیا، خانوە چکۆڵانەکەی لە پیرەژنێك بەکرێ گرتبوو، محەمەد بە عارەبانەیەکی لە تەختە دروستکراوی دوو تایە حەمباڵی دەکرد، هەر کات لە ماڵ بوایە لەمزگەوتی حاجی مراد نوێژەکانی دەکرد، دەزانی دوای کوژرانی دوو کیژۆڵەی لە پاش بەجێماو خێرخوایەك کفنی بۆ کڕی، ئەگینا پارەی

کفنیشیان نەبووـ؟ سێ مانگیش دوای ئەو ڕووداوە، پیرەژنەکە دەیویست کرێی خانوەکە لە ژنە داماوەکەی وەرگرێت، بەڵام پارەی نەبوو تا دواتر پیرەژنەکە گەردەنی ئازاد کرد، دەزانی ئیبراهیم باوك و دایکی ئەو کورە لە خۆشەویستی پێغەمبەر ناویان نابوو محەمەد؟ پێیان وابوو ناوی محەمەد پیرۆزە و هاندەریشە بۆ ئەوەی کورەکەیان ڕێی ڕاست بگرێتە بەر و خوا بناسێت، کەچی ئێوە کوشتتان، یەك لە بریندارەکانیش منداڵێکی نۆ ساڵان بوو بەناوی شاخەوان، بەو بەیانیە دایکی دەینێرێت بۆ کڕینی کەلووپەل، بەڵام ئەبوو حەنیفە نەیهێشت هیچ بکڕێت و بەو تەقینەوەیە هەردوو چاوی بۆ هەتا هەتایە لەدەست دا، ئێستا پێم بڵێ ئایا خوای گەورە ئەم کردەوەیەی ئێوەی پێخۆش بوو، ئایا ئەوەی ئێوە ئەنجامتان دا جیهاد بوو؟

لەگەڵ قسەکانی مامۆستا هیوا فرمێسك لە چاوانم هاتە خوارەوە و ڕەنگم بە جۆرێك تێکچوو لە مردو بچێت، هەستم بە شەرمەزاری دەکرد ئێستا پێموایە بەوە تاوانێکی گەورەم ئەنجام داوە, سەرم خستبوە سەر هەردوو ئەژنۆم، لە ناخەوە دەگریام، بەدەم گریانەوە بە مامۆستا هیوام گوت: ئێستا تێگەیشتم ئێمە مونافیق بووین نەك ئەوان، لێت دەپاڕێمەوە ڕێگایەکم نیشان بدە تاکوو لای خوا و میللەت ڕووی خۆم سپی بکەمەوە، لەگەڵ تۆمە ئەفەندی گیان.

مامۆستا هیوا دەیزانی تازە بەئاگا دێمەوە لەوەی بەناوی خواپەرستیەوە چ تاوانێکی قێزەونم پێ ئەنجام دراوە و ئێستا ئازاری ویژدان هیلاکی کردووم، مۆبایلەکەی دەستی دانا و تۆمار کردنی ڕاگرت، بۆ ئەوەی ناخی پڕ لە ئازارم نەبێتە هۆی ئەوەی

بڕیاری قسەنەکردن بدەم، پێی گوتم : ئیبراهیم پشوو بدە، ئاوێك بە دەموچاوت دا بکە و پەرداغێك ئاو بخۆرەوە.

دوای چەند دەقیقەیەك هاتمەوە ژورەوە، کارمەندەکەی گرتووخانەش دوو چایەی بۆ هێناین، بۆ ماوەیەکی کەم بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ژوورەکەدا، هەردووکمان لە ناو خەیاڵی جیا جیا نقوم بوین، ئەو خەیاڵی لای ئەوە بوو سەرکردە ئیسلامیەکانی وڵاتانی عەرەبی توانیویانە بەشێك لە مەلا و واعیز و ئاینزاکانی کورد لە ڕێگەی ئاینەوە لەخشتە ببەن و بیانکەن بە داردەست و ئامرازی هێنانەدی ئامانج و مەرامەکانی خۆیان کە یەکێکیان ئەوەیە کورد بۆ هەمیشە ژێردەستە بێت و توانا و وزەکانیان لە خزمەتی نەتەوە سەردەستەکانی ناوچەکە بەکاربهێنن، منیش خەیاڵم لای حەمباڵەکەی باتە بوو، لە خۆمم پرسی: ئاخۆ چەند خەونی گەورەی حەمباڵەکەمان خستۆتە ژێر گڵ، ئەو منداڵەی هەردوو چاوی کوێر بوو چ خەتایەکی هەبوو، خۆ ئێستا بەهۆی منەوە ناتوانێ پەپوولە و گوڵ ببینێت، بە گۆچان نەبێ ناتوانێ بەڕێدا بڕوات؟

مامۆستا هیوا زانی بە بیستنی چیرۆکی ژیان و کوژرانی حەمباڵەکەی باتە خۆم وەك تاوانبارێکی گەورە دێتە بەر چاو، هەربۆیەش زۆر پەرێشان دەردەکەوت، بۆیە لە شێوەی دڵدانەوە پێی گوتم: هەموو مرۆڤێك لە ژیان دا هەڵەی کوشندە دەکات، بەڵام گرنگ ئەوەیە دان بە هەڵەی خۆمان دا بنێین و دووبارەی نەکەینەوە و بە هەڵسوکەوت و ڕفتاری خۆمان دا بچینەوە، هەروەها خەڵکی تر ئەزموون لە هەڵەی ئێمە وەرگرن و هەمان هەڵە دووبارە نەکەنەوە، پێم خۆشە بەردەوام بیت لە قسە کردن.

گوتم:

-دڵدانەوەکەت ناتوانێت هیچ لە تاوانەکانم کەم بکاتەوە و خەمەکانم بڕەوێنێتەوە، ڕاستیەکەی حەز بە مردن دەکەم، پێشتر کەمێك هیوام بە ژیان هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی زانیم ئەوەی لەو کردەوەیە کوژرا کێ بوو هەروەها لەو ڕاستیەش تێگەیشتم کە من یەکێك بووم لەوانەی ژیانمان لێسەندەوە، هەست بە دڕندەیی خۆم دەکەم، من دڕندە بووم ......... من گێژ و نەفام بووم. دەبوو ئەو ڕۆژە ئەوانم بناسیبا کە ئاڵای ڕەشیان لە هەمو کوچە و کۆڵانێکی شار پێدانایین.

-ئاڵای ڕەش؟

مامۆستا هیوا سەری سوڕما، چەند پرسیاری ئاڵا ڕەشەکەی لێکردم هێندەش...... بگرە زیاتر هەمان پرسیاری لەخۆی کرد.

پێی گوتم : دەی بۆمی باسکە.

-دەمەو عەسرانێك بانگ کرامە لای ئەبوو حەنیفە، من و ئیسماعیلی ڕاسپارد بێئەوەی ڕدێنمان هەبێت و بەجیا جیا لە دوکانی قوماش فرۆشەکانی بازاڕی قەیسەری قوماشی ڕەش بکڕین، ئەبوو حەنیفە پێی گوتین: لە هەر دوکانێك چەند قوماشی ڕەش هەبوو بیکڕن و هەرکەسە و بیباتەوە ماڵی خۆی، تا لە دەرفەتێك لێتانی وەردەگرین، نرختان لا گرنگ نەبێت بەچەند بوو بیکڕن.

سەرم سوڕما، ئاخۆ قوماشی ڕەشیان بۆ چییە؟ لەسەر ڕاسپاردەی ئەوان من و ئیسماعیل بە جیا جیا هەر یەکەمان

کەوتینە کڕینی هەرچی قوماشی ڕەش هەبوو، وامزانی تەنها من و ئیسماعیل بەو ئەرکە ڕاسپێردراوین، بەڵام دواتر زانیم سەرجەم ئەندامانی ڕێکخستنەکان وەك ئێمە هەرچی قوماشی ڕەشە لەشارەکە کڕبویانە.

دە شەو دوای کڕینی سەرجەم قوماشە ڕەشەکانی بازاڕی قەیسەری، بە پیکابێك کە خۆیان تەرخانیان کردبو و لەوە دەچوو شوفێرەکەش لەو گروپەی خۆمان بوبێت قوماشەکانی ماڵی ئێمە و ئیسماعیلمان گواستەوە ژێرزەمینێکی گەورە کە من پێشتر ئەو شوێنەم نەبینبوو، ژێر زەمینەکە پڕ کرابوو لە تۆپە قوماشی ڕەش، هەر بە جارێك واقم وڕما، لە هیچ بازاڕێکی شاری هەولێر قوماشی ڕەش بەدەست نەدەکەوت، دوای ئەوە نرخی قوماشی ڕەش بۆ هێندەو نیوی جاران بەرز بویەوە، بەزازەکان ناچار بوون لە شارەکانی تر قوماشی ڕەش بۆ مشتەریەکانیان بێنن.

مانگێك زیاتر دوای کڕینی سەرجەم قوماشە ڕەشەکانی شار، ئێوارەیەك بۆ نان خواردن بانگ کراینە شوێنی حەوانەوەی ئەبوو حەنیفە، ژمارەمان زیاتر لە پەنجا کەس دەبوو، زۆربەیانم نەدەناسی و بۆ یەکەم جار بوو بیانبینم، پێشتر هەمووومان ڕدێنمان درێژ و سیمامان لە یەکتر دەچوو، بەڵام ئەو کاتە هەمووومان ڕدێنمان تاشیبوو، لە هۆڵێکی گەورەی ناو خانوەکە کۆکراینەوە، پاش چەند دەقیقەیەك ئەمیر گەیشت، سێ کەسی لەگەڵ بوو، لەناو هۆڵەکە کورسیەکی بۆ دانرابوو، سڵاوی لە هەمومان کردو یەك یەك تەوقەی لەگەڵ کردین و لە هەواڵی پرسین، دواتر گەڕایەوە لای کورسییەکە بێئەوەی

لەسەری دابنیشێت، هەر بەپێوە کورتە وتارێکی دا، گوتی : سڵاوی پێغەمبەر و یارانیتان پێدەگەیەنم، ئێوە ئەهلی خواپەرست و تەقوا و شکاندنی بت و نەیارانی ئاینی ئیسلامن، ئێوە سەحابەی خودان، داوام لێتان ئەوەیە ئەو ئەرك و فەرمانەی ئەبوو حەنیفەی پاڵەوان پێتانی ڕادەسپێرێت بە دڵ و بە گیان جێبەجێی بکەن، ئەوەی ئەو پێشنیاری بکات و بیکاتە بڕیار لای ئێمەش پەسەندە و هەڵقوڵاوی شەرع و دەقەکانە، بۆ بەرچاو ڕوونی هەموو لایەکتان ئێمە هیچ هەنگاوێك ناهاوین ئەگەر ڕەزامەندی خودای لەسەر نەبێت، ئێمە قورئانمان هەیە، بۆ هەموو هەنگاوەکانمان پشت بە قورئان دەبەستین و ئەرکەکان لە نێوان خۆمان بە دادپەروەری دابەش دەکەین، لێرە کەسمان لە وانەی تر گەورەتر نین تەنها خودا نەبێت.

وتارێکی ئاگرین و فریودەرانە بوو، بەشێوەیەك وتاری دا تەفرە بخۆین و وا تێبگەین هەر ئێستا لە مەجلیسی پێغەمبەر و یارانیەوە هاتۆتە لای ئێمە و فەرمانی ئەوی بۆ هێناوین، دوای ئەو کورتە وتارە ئەمیر و سێ پاسەوانەکەی خواحافیزیان کرد و ڕۆیشتن، دوا بەدوای ئەوە گەنجێکی کۆسە کە چەند تاڵەمویەکی کەم بەڕدێنیەوە هەبوو ناو مقەبایەك مقەستی بەسەرمان دا دابەش کرد، ئەبوو حەنیفە گوتی: قوماشەکان لە شێوەی ئاڵا ببڕن بە جۆرێك هەر پارچە ئاڵایەك لە چل سانتیمەتر درێژتر و لە بیست سانتیمەتر پانتر نەبێت، ئینجا بەو دارە باریکەی بەسەرتان دا دابەشی دەکەن بیبەستن.

کات لە نیوەشەو تێپەڕیبوو، پێم وابوو گەورەترین ئەرکی ئاینی بۆ ڕازی کردنی خوای گەورە جێبەجێ دەکەم، زۆر بە دڵسۆزی

مقەستەکەم لە قوماشە ڕەشەکە دەنا، بەشێوەیەك دەمبڕیەوە کە جێی ڕەزامەندی ئەبوو حەنیفە بێت.

ئەو شەوە تا لای نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر زیاتر لە پێنج هەزار ئاڵای ڕەشمان دروست کرد، هەریەکە و گەڕاینەوە شوێن و ماڵی خۆمان، بەڵام پێیان گوتین سبەی کاتژمێر دوانزەی شەو هەموتان لێرە ئامادە بن بۆ تەواو کردنی کارەکانمان.

منداڵەکانم وەك هەتیو وابوون، کەم نەبێت منیان نەدەبینی، هەموو ڕۆژێك لە کاتژمێر شەشی بەیانیەوە دەچومە کارگەکە تا کاتژمێر چواری ئێوارە، زۆربەی شەوانیش لە ئەرك دا بووم، ئەو کاتانەی من دەگەڕامەوە ماڵ هەردوو کوڕەکەم یان لە قوتابخانە بوون یان لە خەودا بوون، سارای خێزانیشم لەوپەڕی بێئومێدی دەژیا و سەرپەرشتی منداڵەکانی دەکرد، ڕەنگ زەرد و لاواز و لات بوو، چەندین جار داوای سەردانی نۆڕینگەی دەکرد، بەڵام بەهۆی سەرقاڵیمەوە نەدەپڕژامە سەر ئەوەی بیبەم بۆ نۆرینگە، ناچار پەنای بۆ باوك و دایکی دەبرد، زۆر بێزار بوو لەو شێوە ژیانە، بەڵام چارەی نەبوو ئارامی گرتبوو، خەمەکانی قوت دەدا و نەیدەهێشت دەروجیران و خزم و خەڵك هەست بە خەمەکانی بکەن و بزانن لەناو چ تەمتومان و خەم و ئازارێك دا هەناسە دەدات.

ڕۆژێك سارا پێی گوتم: لەوە ناترسی ڕۆژێك کە هاتیەوە ماڵ خۆم کوشبێت؟

نەیهێشت قسە بکەم و بەدەم گریانەوە درێژەی دایە قسەکانی: من لە بێوەژن و منداڵەکانیش لە هەتیو دەچین، ئایا لە خوا

ناترسی کە وەك باوکێکی میهرەبان و مێردێکی باش ڕەفتار ناکەی؟ ئایا هەست بەوە ناکەی ئێمەت فەرامۆش کردوە؟ تکا دەکەم ئاوڕێك لە ژیانمان بدەوە و هەست بە نالەباری ژیانمان بکە، بزانە لە چ دۆخێکی دەروونی خراپ دا دەژین، ئەگەر پێتوابێت خوا پێی خۆشە ئاوها ڕەفتار بکەی ئەوە هەڵەی.

سارا ژنێکی بێدەنگ و هەست ناسك بوو، کەم توڕە دەبوو، هەست ناسکییەکەی نەدەگەیاندە توڕەیی و هەڵچوون، بگرە بەلای بێدەنگی دا بردبوی، لە ناخیش دا دەمزانی لەسەر حەقە، هەرچەندە ئەوسا ئەم حەقەم نەسەلماند بگرە خۆیشم لێی توڕە کرد، بەڵام ئێستا دەزانم من زوڵمم لە ساراو منداڵەکانم دەکردو خواپەرستیەکی کوێرانە بەرچاوی لێڵ کردبووم تا ئەو ئاستەی هەمویان بکەم بە قوربانی تێگەیشتنەکانی خۆم، کە منیش لەو گروپە وەرمگرتبوو.

کاتژمێر دوانزەی شەو لەگەڵ ئیسماعیل چوینەوە هەمان شوێنی شەوی پێشوو، هەموو ئەندامان لەوێ بوون، تەواوی ئەندامان کرانە پانزە گروپی جیاجیا، هەر گروپێك سەرپەرشتیکارو شوێن و شەقام و گەڕەکی بۆ دیاریکرا، هەموو گروپەکان لە یەك کات دا ڕەوانە کراین بۆ ناو شار، پێیان گوتین بەهیچ شێوەیەك لەنزیك ئەو فەرمانگە و دامەزراوە حکومی و حزبیانە ئاڵا دامەنێین کە پاسەوانیان هەیە وەك پۆلیسخانە و ئاسایش و دادگاکان و بارەگا حزبیەکان.

تیمی ئێمە بریتی بوین لە پێنج کەس، گەڕەك و بازاڕی ئیسکان بە ئێمە سپێردرا، لە ماوەی یەك کاتژمێردا تەواوی ئەو شوێنانەی بۆمان دیاریکرابوو بە ئاڵای ڕەش پڕمان کردەوە و بەرەبەیان

هەریەکەمان گەڕاینەوە ماڵی خۆمان، لە ڕێگا لە ئیسماعیلم پرسی ئامانج لەم کردەوەیە چیە؟ چی شتێکی شەرعی و ئاینی تیایە ئەویش؟ گوتی : دەمانەوێ بەم کردەوەیە بە حکومەت بڵێین جگە لە ئێوە هێزێکی تر هەیە و خاوەنی پەیامی خوداییە و قورئان ڕێبازی کارکردنیانە.

کاتێك هەتاو هاتە دەرەوە و خەڵك بۆ سەر کاروبار و فەرمانگەکانی خۆیان ڕۆیشتن بینیان زۆرینەی کوچە و کۆڵان و بازاڕە گشتییەکان و سەر دیواری فەرمانگە حکومیە بێ پاسەوانەکان بە ئاڵای ڕەش داپۆشراون، حکومەت و دەزگا ئاسایشیەکان بە زوویی کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری و چاودێری بازاڕ و شوێنە گشتیەکان و کەسە گومانلێکراوەکان و کۆکردنەوەی ئاڵا ڕەشەکان.

شەوێك من و ئیسماعیل و چەند کەسێکی تر لەشوێنی حەوانەوەی ئەبوو حەنیفە دانیشتبوین، گفتوگۆمان لەبارەی دەقەکان و سونەت و ئەو کارانەی بیدعەن دەکرد، گفتوگۆیەکی گەرم بوو، کاتێك ئەبوو حەنیفە هاتە ژورەوە و بانگی من و ئیسماعیلی کردە ژوورەکەی خۆی، پێی گوتین زانیاری دروستمان هەیە لەسەر یەك لەوانەی لە هەڵواسینی ئاڵا ڕەشەکان لەگەڵمان بوو، کە ژێر بەژێر پەیوەندی کردوە بە دەزگای ئاسایشەوە، پەیوەندیەکەی لە قۆناغی سەرەتادایە و هێشتا هیچ زانیاریەکی لەسەر ئێمە نەدرکاندوە، ئێستا ئێمە گرتومانە و پێویستە هەردووکتان بچن چارەی بکەن، ڕەنگم سپی بوو، دڵم کەوتە لێدان بە شێوەیەك ئەوەی لە نزیکم بوایە گوێی لەترپەی دەبوو.

چارەی بکەن یانی چی؟ بەهەمـوو تەمەنم مێشـێکم نەکوشـتبوو چـۆن دەتوانـم پیاوێك بکـوژم؟ ئاوهـام بەخۆم گوت.

کوڕەکەیـان بـە دەسـت و چـاو بەسـتراوەیەوە هێنـا، بردیانـە حەمامێکـی گـەورە، لـە نزیـك حەمامەکە بە ئیسـماعیلم گـوت: زۆر دەترسـم، تـا ئێسـتا نەمتوانیـوە مێرولەیەکیـش بکـوژم.

ئیسـماعیل گوتـی : هـەر ئەرکێـك کـە شـەرعی لـە پشـت بـوو لێـی مەترسـە، چونکـە خـودا پشـتیوانمانە، پرسـیم: کـوا خـوای گـەورە تەئیـدی کوشـتنی کـردوە؟ ئەویـش بـە تونـدی گوتـی : کەرەکـەر گـەر ئێمـە نەیکوژیـن ئـەو ئێمـە دەکـوژێ.

گوتـم : ئاخـر ئـەو لای ئێمـە دیلـە، چـۆن دەتوانـێ بمانکـوژێ خـۆ چەقۆیەکیشـی پێنیـە؟ ئەویـش گوتـی : بێئەقـڵ بـە دەسـتی حکومـەت بەکوشـتنمان دەدات.

دەسـت و قاچـم دەلـەرزی، زەندەقـم چوبـوو، چوینـە نـاو حەمامەکـەوە، لەسـەر ڕەفـەی نـاو حەمامەکـە دوو چەقـۆی درێـژی لـێ دانرابـوو، دەمـی چەقـۆکان خوێنـی وشـکەوەبووی بەسـەرەوە بـوو، وا دەهاتـە بەرچـاوم کـە پێشـتر بـەو دوو چەقۆیـە لـە هەمـان شـوێن خەڵکـی تـری پێکوژرابـێ، ئیسـماعیل چەقۆیەکـی دایـە دەسـتم و ئـەوی تریـش لەنـاو دەسـتی ڕاسـتی تونـد گرتبـوو، بـە دەنگـی ئەڵلاهـو ئەکبـەرەوە یەکـەم چەقـۆی بـۆ سـەر دڵـی ڕاوەشـاند و بـە ئامـاژەی سـەر تێیگەیاندم منیـش چەقۆ ڕاوەشـێنم، لەگـەڵ یەکـەم چەقـۆ کوڕەکـە هـاواری لێبـەرز بـوەوە، دادو فیغانـی کـرد، هـاواری بـۆ خـوا دەبـرد، دەگریـا و دەپاڕایـەوە، منیـش بـە دەسـتێکی لـەرزۆك و ترسـێکی زۆرەوە دامە بـەر چەقۆ،

بە هەردووکمان زیاتر لە بیست چەقۆمان لێدا، تا نوزەی تیا بوو چەقۆی بەر کەوت، ئنجا ئیسماعیل چەقۆکەی خستە سەر گەردنی و سەری لە لاشەی جیاکردەوە، ئنجا بە هەردووکمان پەلپەلمان کرد، خوێنەکەی دەچوە ناو کونێکەوە لەوێوەش بۆ ناو زێرابی خانوەکە.

تەلیسێکی سپی ئامادە کرابوو، پارچە لەتلەتکراوەکانی کوڕەکەمان خستە ناو تەلیسەکەوە و بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی بردمانە شوێنێکی چۆڵ و خستمانە ژێر زەوی .

ئەو شەوە خەو نەچوە چاوم، دەنگ و هاتوهاوار و پاڕانەوەی ئەو کوڕە لە مێشکم دەرنەدەچوو، ئازاری ویژدان تینی بۆ هێنابوم، چەندین شەوی دوای ئەو کارە نیوەشەو لەخەو ڕادەچەڵەکیم، ترسێکی زۆر چوە دڵمەوە، وای لێهاتبوو لە ماڵی خۆشمان نەمدەوێرا بچمە تەوالێت، بێدەنگ و بێهەست لە ماڵەوە دەجوڵامەوە، نانم کەم پێدەخورا، دڵم بەتەواوی گیرابو و ئیشتیهام بۆ هیچ خواردنێك نەدەچوو، ئەوەندەی کە لە ماڵەوەش بوم وەك لاشەیەکی مۆمیا کراو وابوم، لە کارگەش هەستم بەخۆم دەکرد لەناو کوورەی ئاگرێکی گەورەدام وا خەریکە هەموو گیانم دەسوتێنێ، لە کاتی خەوتن دا دەمارە سپییەکانی مل و دەست و لاقی کەرت کەرتکراوی کوڕەکە دەهاتنە بەرچاوم.

زانیان ڕەنگ و ڕوخسارم بە تەواوی شێواوە و ترسێکی زۆر چۆتە دڵمەوە، بۆ ئەوەی کەمێك ئارام ببمەوە، هەفتەیەك مۆڵەتیان پێدام تا لەگەڵ ژن و منداڵەکانم بژیم و کەمێك ئاسودەیی بەوانیش ببەخشم، دەمویست تەمی گومان و دڵەڕاوکێ و

تەنهایی ژن و منداڵەکانم کەم بکەمەوە و کەمێک چێژی ژیانیان پێببەخشم، دەمویست بیانبەمە بازاڕ و جلوبەرگی نوێیان بۆ بکڕم و دڵنەواییان بدەمەوە و خۆشم دیمەنی کوشتن و پەلپەل کردنی کوڕەکەم لەبەرچاو لابچێت و ئیدی لەبیری خۆمی ببەمەوە. بڕیارم دا گەشتێکی ناو پارکەکانی شار و چەرخ و فەلەك و ژێر قەڵایان پێبکەم، هەوڵم دەدا لاقەکانم توانای ڕۆیشتنیان هەبێ، بەڵام مێشك و دڵم بەهۆی ئەو نائارامیەی ڕویتێکردبووم نەیاندەهێشت هەنگاو هەڵێنن، ئیسماعیل پێی گوتم: بیرت نەچێت ساتی کوشتن و پەلپەل کردنی کوڕەکە بە کامیرا تۆمار کراوە. ئەم قسەیەی ئیسماعیل بۆ ئەوە بوو نەتوانم هیچ نهێنیەکی ئەو شەوە بدرکێنم، چونکە خۆم یەکێك بووم لە تاوانبارەکانی ئەو کردەوەیە.

هەرچۆنێك بێت پاشنیوەڕۆیەکی هەینی بەرەو بازاڕ و پارکەکانم بردن، هەستی بەرپرسیارێتی خێزان و باوکایەتی هانیدام زۆر شوێنیان پێنیشان بدەم کە پێشتر هەرگیز نەیانبینیبو، بە شەقامی باتەدا تێپەڕین بەرەو شەقامی مزەفەریە و ئنجا پارکی منارە، لە شەقامی باتە بە نزیك شوێنی تەقینەوەکەدا تێپەڕین، لەسەر ڕەسیفەکە لە مەترێك دا پەڵەی ڕەشم بەدی کرد، وا تێدەگەم خوێنی حەمباڵەکە بوبێ کە دوای شۆرینیش هێشتا شوێنەواری مابن، لەوێ ئەوسا ئەو کردەوەیەم، بە پاڵەوانێتی بۆ خۆم لەقەڵەم دەدا، هەستمدەکرد هەر لەو شوێنە خودام لە خۆم ڕازی کردبێت بێئاگا بووم لەوەی ئەوە من بووم مافی ژیانم لە مەردومێکی بێخەتا سەندۆتەوە و دوو منداڵم هەتیو کرد و ژنێکی بەسزمانم بێوەژن کرد، ئەوە من بووم لە پەنای قورئانی پیرۆز و حەدیسەکانەوە ڕق و قینەی کۆمەڵێك کەسی

هەوەسبازم بەسەر ئەهلی شاردا ڕشت.

لە پارکی منارە منداڵەکانم خستبوە سەر جۆلانە قاقا پێدەکەنین و دڵخۆشی خۆیان دەردەبڕی، منیش دڵتەنگ و نائارام بووم.

سەرەتای گەشتەکەی ناو بازاڕ و بینینی شوێنە گشتیەکان دڵی سارای خۆشنەکرد، بەڵام دواتر گفتوگۆی نێوانمان و مجامەلەی من بۆ ئەو، هەروەها قاقای منداڵەکان ئەویشی دڵخۆش کرد و هێوری کردەوە.

دڵخۆشیەکانیان کاتی بوون، هەر زوو بەسەر چوون، دیسان وەك بێ باوك و بێ پیاو دەرکەوتنەوە، پاش ئەو هەفتەیە کەوتمەوە سەر کار، ڕۆژانە دەچومەوە کارگە و خەریکی پەتاتە شۆرین و خستنی بۆ ناو بڕەڕی کارگەکە بووم کە چپسی لێ دروست دەکرا، ئەندازیارێك سەرپەرشتی گشتی کارگەکەی دەکرد کە یەکێك بوو لە ئەندامە دڵسۆزەکان، بەڵام بۆ کارگەکە و بۆ بەرهەمی کارگەکە کە دەگەیشتە دەستی منداڵان دڵسۆز نەبوو، دەیان تەن پەتاتەی بۆگەن و بەسەرچوویان دەخستە ناو کارگەکەوە، تەنها لەبەر ئەوەی هەرزان بوون، بۆ ئەوەی زۆرترین قازانج بگەیەنن بە گروپ، گەرچی ئەم تێبینیەم بە ئەبوو حەنیفە ڕاگەیاند کە پەتاتەی ڕزیو و ماوە بەسەرچوو دەکرێتە چپس، بەڵام ئەبوو حەنیفە بە وەڵامێکی کورت بێدەنگی کردم و گوتی: کاری تۆ پەتاتە شۆرینە نەك چاودێری و ڕەخنە گرتن، ئێمە خۆمان لێپێچینەوە لە کەموکوڕیەکان دەکەین.

لەو ماوەیە هەستم بە ئازایەتی خۆم دەکرد، سەرەڕای ئەوەی گومانم لەوە هەبوو کە کردەوەکانمان جێگەی ڕەزامەندی خودا

بن، بەڵام بە وتاری ئاگرینی ئەبوو حەنیفە و ئەمیر دووبارە شەحن دەبومەوە و گومانەکانم دەڕەوینەوە.

مانگێك زیاتر دوای تێپەڕبوون بەسەر کوشتن و پەلپەل کردنی کوڕە گەنجەکە من و دوو کەسی تریان ڕاسپارد بۆ کردەوەیەکی تر، ئەویش ڕفاندنی کچێك بوو بەناوی شەکراو، ئەو کچە لە قوتابخانەیەکی ئامادەیی تازە دامەزرابوو، پێیان گوتین دەبێت ئێوارە دوای گەڕانەوەی لە قوتابخانە مامۆستا شەکراو بڕفێنن، من نەمدەزانی تاوانی ئەو کچە چیە، بەڵام کە فەرمانمان بۆ دەرچوو نەماندەتوانی بپرسین: بۆچی دەیڕفێنین یان تاوانی چییە، بۆمان نەبوو هیچ پرسیارێك بکەین جگە لەو پرسیارانەی پەیوەست بوون بە سەرکەوتنی کردەوەکەمان، تەنها لە ئیسماعیلم پرسی: بۆچی ئەو کچە دەڕفێنین؟ ئەویش گوتی ئەو کچە تا ئەژنۆی ڕوتە و بەرەڵایی بڵاو دەکاتەوە، دوکانی مۆدە و پرچ چاك کردن و ڕازانەوەی کچانی هەیە، ئەم کارانەشی پێچەوانەی شەرعی خوایە و دەبێ تەمبێ بکرێ، تا خەڵکی تریش دوور بکەونەوە لەو شێوە کارەی ئەو، پرسیم : جا بەشێك لە خەڵکی ئەم شارە تا ئەژنۆ و باسکیان ڕووتە خۆ ناتوانین گشتیان لەناو ببەین.

ئیسماعیل یەك لە کەسە پلە بەرزەکانی گروپەکەمان بوو، توانایەکی زۆری هەبوو لەوەی کەسی بەرانبەر بخاتە سەر هەمان تێگەیشتن و بیرو باوەڕی خۆیان، گوتی: ئەبوو جەعفەر بزانە ڕاوچی کە لە شوێنێك ڕاوی سوسکە دەکات تا عەیامێکی دوور سوسکەی تر تخونی ئەو شوێنە ناکەون، ئێمەش دەمانەوێ بە تەمبێ کردنی ئەو بەرەڵایە، خەڵکی تریش لەو ئەتوار و کارە

قێزەون و ناپەسندانە دورکەونەوە کە دەبنە مایەی زیان بۆ کۆمەڵگەکەمان.

دوای ئەوەی کاری منیان لە کارگەو شۆرینی پەتاتەوە گۆڕی بۆ پاسەوانێتی خانوەکەی ئەمیر، ئنجا بۆم دەرکەوت کە ڕفاندنی مامۆستاکە چیرۆکێکی تری لە پشتە نەك بەرەڵایی و قاچ وقولی ڕوت.

مامۆستا هیوا داوای لێکردم چیرۆکی ڕفاندنەکەی بۆ باس بکەم، منیش چیرۆکەکەم وەك خۆی بۆی باسکرد:

-دە پانزە ڕۆژێك بەر لە ڕفاندنی مامۆستاکە، ئیسماعیل پێی گوتم : ئەمیر کاری پێتە، دوو بە دوو چووینە لای ئەمیر، وەك جارانی پێشوو بەخێرهاتنی کردین و گوتی: لە دڵسۆزی و ئازایەتیت دڵنیام بۆیە ئەرکی پاسەوانێتی ئەم خانوە و ژیانی خۆمت پێدەسپێرم، لێرە تۆ بەرپرسی ئەو چەند کەسە دەبیت کە تا ئێستا پاسەوانی ئێرە بون، ئیتر لێرە موچەکەشت بۆ دەکەین بە پێنجسەد هەزار دینار و مجاهیدێکی تر لەشوێنی تۆ لەکارگەکە دادەنێین، منیش ڕازی بووم، دوای ئەوە ئیسماعیل و کەسێکی تر کە دەمامکدراو بوو، ڕاهێنانی چەکی کلاشینکۆف و دەمانچەیان پێکردم، فێریان کردم چۆن نارنجۆك بەکاربهێنم و ( تی ئێن تی ) بتەقێنمەوە و کەرەستە تەقێنەرەوەکان بناسم و بزانم بەکاریانبهێنم، لە دواین ڕۆژی مەشقەکانم لە ئیسماعیلم پرسی: ئێمە بانگخوازین یان شەڕکەر؟ ئایا چ پێویستیمان بەم چەك و کەلوپەلە سەربازیانە دەبێت؟ ئەویش گوتی: ئەوانەی مەککەیان لە جەهالەت و کوفر پاك کردەوە، فێرکران چۆن شمشێر بەکاربهێنن و بە چ شێوازێك ڕم بهاون و چۆن دڵی

کافرەکان بپێکن، کاتێک ئێمەش بمانەوێ بەشێك بین لەسوپای مسوڵمانان و بمانەوێ جیهان لە جەهل و کوفر پاك بکەینەوە، پێویستیمان بە جیهادە، بۆ جیهاد کردنیش پێویستیمان بە چەك و کەرەستەکانی شەڕ و شارەزا بوون و چۆنییەتی بەکارهێنانی چەك دەبێت.

لە ماوەی پێنج ڕۆژدا بەتەواوی ڕاهێنرام لەسەر بەکارهێنانی چەکی کلاشینکۆف و دەمانچە و چۆنیەتی دەسبەسەراگرتن و ڕفاندن و تەقاندنەوەی ( تی ئێن تی ) و چۆنیەتی کەلەپچە کردن، ئەوسا هەستم بە شانازیەکی گەورە دەکرد و پێموابوو ڕۆڵی سەحابەکان دەبینم، وەنەبێ مەشق و ڕاهێنان تەنها بەمن کرابێ، بەڵکو تەواوی ئەوانەی هاتبوونە ڕێزی مجاهدینەوە، هەمان مەشقیان بینیبو و هەمان تێڕوانینی منیان لا چەسپێنرابوو کە پێویستە جیهاد بە بەشێکی گرنگ لە خواپەرستی بزانین.

لەو ماوەیەی لە ئەرکە نوێکەدا بووم، زۆر نهێنی گروپەکەم بۆ دەرکەوت کە پێشتر لێیان بێئاگا بووم، خانوەکەی ئەمیر کۆشکێکی سێ نهۆمی گەورە بوو، ژێرەوەی گەراجی چەندین ئۆتۆمبیلی بێ سەرەتا و علوج بوو، پڕ بوو لە قتوی بۆیەی ئۆتۆمبیل، سەرەتا نەمزانی ئەمان چ کاریان بە بۆیەی ئۆتۆمبیلە، بەڵام دواتر تێگەیشتم هەر ئۆتۆمبیلێکیان لەهەر کردەوەیەك دا بەکارهێنابێت دوای کردەوەکە ڕەنگەکەیان گۆڕیوە تا هێزە ئەمنییەکان هەستی پێنەکەن و سەرەداوی کردەوەکانیان دەست نەکەوێت، لە سوچێکی ژێرزەمینەکە دەیان تابلۆی ژمارە کاتی و مەنەفێست و ژمارەی ساختەی لێدانرابوو کە بۆ بەلارێدا بردنی چاوی هێزە ئەمنییەکان بەکاریان دەهێنا،

هەروەها دەیان دەمامك و كەلەپچەو كەرەستەی شوشە بڕین و چەقۆ و كەتەر و حەبل و دەڕنافیز لەناو سندوقێك دانرابوو، هەر لەنهۆمی یەكەم ژورێكی بچوكی تیابوو دەرگایەكی ئاسنی پتەوی پێوەبو، لەو ژورە بچوكەوە ڕێگە هەبو بگەیتە ژێرزەمینی خانوەكە، كە پڕ بوو لەچەك و فیشەك و تفاقی سەربازی و كەلەپچە و دەمامك، ئەو ژێرزەمینە بەسترابووەوە بە تونێلێكی یەك مەتری كە لەژێرزەمینەكەوە برابوە دووسەد مەترێك لە دوری كۆشكەكە، سەرەتا نەمزانی كاریان بەو تونێلە چیە، دواتر لێی تێگەیشتم لە ئەگەری ئاشكرا بون و پەلاماردانی هێزە ئەمنیەكان بۆ خۆدەرباز كردن بەكاریدەهێنن.

لەو كۆشكە سێ كەسی دەستڕۆیشتوو هەبوو كە بریتی بوون لە ئەمیر و ئەبوو حەنیفە و ئیسماعیل، دوای ئەوان دەسەڵاتی تەواو درابوو بە من. گەرچی لە سەرەتادا من دەست سپی و ناشارەزا بووم لە بەڕێكردن و بەڕێوەبردنی كاروباری كۆشكە نهێنیەكەی ئەمیر، بەڵام هەمیشە ئەبوو حەنیفە و ئیسماعیل ڕێنوێنیان دەكردم و چۆنیەتی مامەڵە كردنم لەگەڵ ئەو واقیعە نوێیەیان فێركردم، ڕایانهێنام لەسەر ئەوەی بەڕۆژەوە پاسەوانێتی باڵەخانەكە بەبێ چەك بگرینە ئەستۆ، تەنها لەشەوان دا چەكمان پێبێت، بەیانیش بەر لەتاو كەوتن چەكەكان كۆبكەمەوە و لەژوورێكی نهۆمی سێیەم هەڵیانگرم.

نهۆمی دووەمی كۆشكەكە شوێنی دانیشتنی ئەمیر بوو كە زیاتر لە حەوت ژوور و دوو تەوالێت و دوو حەمامی تیابوو، نهۆمی سێیەمم نەبینیبوو، چونكە ئەبوو حەنیفە پێی گوتم كارتان لە نهۆمی سێیەم نیە و ڕێگەش مەدە هیچ كەسێك

بە پاسەوانەکان و خۆشتەوە بچنە نهۆمی سەرەوە، تا ئەمیر فەرمان نەدات، تەنها بۆ دانانی چەکەکان دەچیتە ژووری کۆگا لە نهۆمی سێیەم.

شەوێکیان کاتژمێر لە دوو تێپەڕیبوو، تەواوی پاسەوانانی کۆشکەکە لە خەودا بوون و نۆرە پاسەوانێتی خۆم بوو، دەرگای حەوشەم کلیل دا و بە پەیژەکەدا سەرکەوتمە نهۆمی سێ، دەرگای هەموو ژوورەکان دەهاتنەوە ناو هۆڵێکی گەورەی حەوت مەتری، لە ناوەڕاستی هۆڵەکە مێزێکی گەورە و دوو کورسی لێبوو لەسەر مێزەکە چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەك و دوو کتێبی ئاینی و قورئانێك دانرابون، لەسەر گۆڤارەکان کۆمەڵێك کلیلم بەدیکرد لەوە دەچوو کلیلی تەواوی کۆشکەکە بووبێ، سەرەتا سەرێکم کێشا بە کۆگای چەك هەڵگرتن، بەو کلیلەی کە پێم درابوو دەرگاکەم کردەوە، شوێنی هەڵگرتنی چەکەکانی ئێمە سندوقێکی گەورە بوو، لەولاتر دوو سندوقی ترم بەدیکرد کە لەسەر یەکتر دانرابون ئەوانیش پڕ بوون لە چەك و فیشەك، لە تەنیشتی ئەوان سندوقێکی تر هەبو پڕبوو لە نارنجۆك، دەرگاکەم داخستەوە و کۆمەڵە کلیلەکەی سەر مێزەکەم هەڵگرت، دوایە بیرم لەوە کردەوە کە هەر دەرگایەك بکەمەوە دەچێتە خانەی ناپاکی کردن لە گروپەکە ، کلیلەکانم لە شوێنی خۆی دانایەوە.

دوو هەنگاوم نا تا بێمە خوارەوە، بەڵام جارێکی تر کەڵکەڵەی بینی ژوورەکانی تر هات بە مێشکمدا، لە دڵی خۆمدا دەمگوت چۆن دەبێت سەرەڕای ئەوەی ئەم هەموو کارانەیان بە دڵسۆزی بۆ ئەنجام دەدەم، بەڵام نهێنیەکانی ئێرەم لێبشارنەوە مەگەر

منیش بەشێك نیم لەوان؟ دیسانەوە بە خۆمم گوت: گەر ئەمان لەپێناوی سەرخستنی ئاینی ئیسلام تێبکۆشن بۆچی نهێنی لەوانە بشارنەوە کە وەك خۆیان دڵسۆزن؟ جارێکی تر کلیلەکانم هەڵگرتەوە و دەستمکرد بە تاقیکردنەوەیان داخوا کام ژوور دەکەنەوە؟ دوای تاقیکردنەوەی یەك یەك کلیلەکان ژوورێك کرایەوە، تیایدا تاخم سیسەمێکی خەو و بۆفیەیەکی جلوبەرگ و ڕەفەیەکی کتێبی تیا بوو، لەسەر سیسەمەکە نامەیەکی دەستنوس کەوتبوو، هەڵمگرتەوە و دەستم کرد بە خوێندنەوەی، لە ژێر سیسەمەکە بڕێك پارەی عێراقی لەناو کیسەیەکی بچوك دانرابوو، هەرچەندە پارەکەم نەژمارد، بەڵام بیست تا سی ملیۆن دینار دەبوو، لەناو بۆفیەکە دەستێك چاکەت و پانتۆڵی نوێ و تاخمێك جلی ژنانە دانرابوون، سەرەتا ئەو هەستەم لا دروست بوو کە جلە ژنانەکە جلی خێزانی ئەمیر بێت، بەڵام دواتر بۆچونم گۆڕا، بە خۆمم گوت: ئێرە ماڵی ئەمیر نیە تا ستیانو مایۆ و ژێرکراس و کراسی تری لێدانرابێت، ترس دایگرتم، هەستم بە مەترسی کارەکەم کرد و وام هێنایە بەرچاوم کە لەم کاتەدا ئەمیر خۆی دەکات بە ژووردا و بەو حاڵەوە دەمبینێت، ویستم نهۆمی سێیەم بەجێبهێڵم و خۆم تەریك بگرم لەو نهێنیانەی خەریك بوو بۆم ببن بە بەڵا، بەڵام دواتر هێور بومەوە و بڕیارم دا هەر دەبێ ژوورەکانی ئەو نهۆمە بپشکنم و وەڵامی ئەو پرسیارەم دەستبکەوێ کە بۆچی نهۆمی سێیەممان لێقەدەغە کراوە؟ هەر ئەو پرسیارەش بوو هانیدام دەست بۆ کۆمەڵە کلیلەکە ببەم و یەك یەك ژوورەکان بپشکنم.

هەر لەناو بۆفییەکە دەیان نامەی تر هەبوون کە بەو خێراییە پێم نەدەخوێنرانەوە، بەڵام ئەوەم بۆ دەرکەوت هەندێکیان

نامـەی مامۆسـتا شـەکراو بـوو.

نامەیەکـی تـرم بەرچـاو کـەوت لەلایـەن کاربەدەسـتێکی گـەورە ئاراسـتەی ئەمیـر کرابـوو، لەنامەکـە نووسـرابوو ئـەوە پێنـج هەزار فیشـەکی کلاشـینکۆف و هـەزار فیشـەکی دەمانچـەم بـۆت ڕەوانە کـرد پشـت بەخـوا سـەردەکەوین، تـا خوێندنـەوەی ئـەو نامانـە نەمزانـی ئەمیـر نـاوی ڕاسـتەقینەی چییـە، بـەڵام ئـەو شـەوە بـۆم دەرکـەوت ناوی شـوانە.

هـەر لەنـاو بۆفیەکـە چەندیـن کاسـێتی ڤیدیـۆ و کاسـێتی گـەورە و بچووکـی تـر و فـلاش میمـۆری هەبوون، بـەڵام من شـارەزا نەبووم لـە بەکارهێنانیـان، تـا بزانـم چییـان تیـا تۆمـار کـراوە، لای ڕاسـتی بۆفیەکـە خاولیـەك لـوول درابـوو کـە ڕوانیـم دەمانچەیەکـی نوێی تیـا هەڵگیرابـوو، بەدەسـتی ڕاسـتم دەمانچەکـەم هەڵگـرت لـە دڵـی خـۆم دا دەمگـوت: داخـوا چەنـد کەسـی پێکـوژراوە؟ دیسـان بـە خۆمـم گـوت: داخـوا کەی بـەم دەمانچەیـە نۆرەی کوشـتنی منیش دێـت؟ خـوارەوەی بۆفیەکـە ئەلبومێکـی وێنـەی تیـا بوو کـە پڕ بوو لـە وێنـەی ئەمیـر و مامۆسـتا شـەکراو و کەسـانی تریـش، تەنانـەت وێنـەی خێزانـی ئیسـماعیل و ئەبـوو حەنیفەشـم تیـا بەدیکـرد، دڵم داخورپـا، ئـای خوایـە وێنـەی خێزانـی ئیسـماعیل و ئەبـوو حەنیفە لـە ئەلبومـە تایبەتیەکـەی ئەمیـر چـی دەکـەن؟

خێـرا خێـرا دەگـەڕام تـا وێنەی سـارای خێزانـم بدۆزمـەوە، هەموو لاپەڕەکانـی ئەلبومەکـە گـەڕام، گشـتیم دوبـارە و سـێبارە کـردەوە، سـوپاس بـۆ خـوا کـە وێنـەی سـارای تیـا نیـە، لـە دڵـی خۆمـدا وامگـوت. لەنـاو ڕەفـەی کتێبـەکان کۆمپیوتەرێـك دانرابـوو، گـەر بمتوانیایـە بەکاریبهێنـم زۆر نهێنـی تـرم بـۆ دەردەکـەوت.

هەمـوو ژوورەکان و تەنانـەت حەمـام و تەوالێتەکانیـش گـەڕام تـا نهێنیەکانـی نهۆمـی سـێیەمم بـۆ ئاشـکرا بێـت، بەرەبەیانێکـی درەنـگ هەمـوو دەرگاکانـی نهۆمـی سـێیەمم وەك خـۆی کلیـل دا، ئنجـا کلیەکانیشـم لـە هەمـان شـوێنی پێشـوی دانایـەوە و هاتمەوە نهۆمـی دووەم، بـە دڵێکـی غەمگینەوە ئیشـکگریم تەسـلیمی ئەبوو زیـاد کـرد و لێـی خەوتـم بێئەوەی نوێـژی بەیانـی بکـەم.

مامۆسـتا هیـوا لەوپـەڕی گومانـەوە لێـی پرسـیم: بۆچـی نوێـژی بەیانیـت نەکـرد خـۆ تـۆ بـاوەڕدار بـووی؟

-هەڵماڵیـن و دەسـتکەوتنی نهێنیەکانـی ئـەو شـەوەی کۆشـکەکە نـاوی خۆشـمی لەبیـر بـردەوە چجـای نوێـژی بەیانـی، ئیـدی تێگەیشـتم ئـەوەی مـرۆڤ بـەرەو نوێـژ کـردن دەبـات ئیمانـە.

ئێوارانێـك مـن و ئیسـماعیل و کەسـێکی تـر کـە تەنهـا لـە شـەوی هەڵکردنـی ئـاڵا ڕەشـەکان بینیبـوم، لـە کۆڵانـی دووەمـی بەردەمـی قوتابخانەکـە لەنـاو ئۆتۆمبیلێکـی بیئێمـی جامـڕەش چاوەڕێـی هاتنـی مامۆسـتا شـەکراومان کـرد، پلانەکـە وابـوو هاوڕێکەمـان ئۆتۆمبیلەکـە لێبخورێـت و منیش مامۆسـتاکە لە دواوە قۆڵبەسـت بکـەم و ئیسـماعیلیش بۆنێکـی تایبـەت لـەدەم و لوتـی بـدات بـۆ ئـەوەی بێهۆشـی بـکات، ئـەو کۆڵانـەی ئێمـە لـە بۆسـەیدا بویـن ڕێـی هەمیشـەیی مامۆسـتا شـەکراو بـوو کـە پیایـدا دەگەڕایـەوە ماڵـی خۆیـان. دەمەدەمـی خۆرئاوابـون بـوو، مامۆسـتا شـەکراو وەکـو ڕۆژانـی پێشـوو لەسـەرخۆ بـەرەو لای ئێمـە هەنـگاوی دەنـا، هەنگاوەکانـی درشـت نەبـوون، سـەری نـەوی بـوو تەنهـا پێـش خـۆی و هەنگاوەکانـی دەبینـی، کراسـێکی قـۆڵ کورتـی پەمەیـی و تەنورەیەکـی کورتـی ڕەشـی لەبـەر بـوو تـا ئەژنـۆی

ڕووت بوو، بە خۆمم دەگوت ئەم بەرەڵایە حەقی تۆپاندنە، پرچی بۆ پشتەوە هەڵدابوەوە و لە دواوە بەتەوقەیەکی ژنانە بەستبوی، لەو شوێنەی ئێمەی لێوەستابوین جگە لە دوو منداڵ کە یاریان دەکرد کەسیتر دیار نەبوو، من لەنزیك ئۆتۆمبیلەکە وەستابووم، ئیسماعیل لە کوشنی دواوە و شوفێرەکەش لە شوێنی خۆی لە ئامادەباشیدا بوو، مامۆستا شەکراو لە ئاست ئێمە هەنگاوێك دوور کەوتەوە، بەڵام لە کتوپڕێك دا لە دواوە پەلامارمدا و هەردوو دەستیم خستە ناو کەلەپچەیەکەوە، لە هەمان چرکە ئیسماعیل بە خێرایی گەیشتە بەردەمی مامۆستا شەکراو، بە پەلە بۆنەکەی خستە سەر دەم و لوتی و بەرەو سندووقی ئۆتۆمبیلەکە پەلکێشمان کرد بێئەوەی بواری بدەین هاوار بکات یان هەوڵی خۆقوتارکردن بدات خستمانە ناو پاشکۆی ئۆتۆمبیلەکە. کاتێك گەیشتینەوە کۆشك مامۆستا شەکراو بێهۆش بوو، یەکسەر ناوەرۆکی نامەکەم کەوتەوە بیر کە مامۆستا شەکراو بۆ ئەمیری نووسیبوو، لە خوێندنەوەی نامەکەرا زانیم ڕفاندنەکەی چ پەیوەندیەکی بە بەرەڵایی و قاچ وقولی ڕووتیەوە نیە، بەڵکو پەیوەستە بە حەزەکانی ئەمیرەوە.

لەسەرەوەی نامەکە بێ سڵاو کردن نوسیبوی: کاك شوان من دوا بڕیارم داوە جارێ شوو نەکەم، جگە لەوەش وەك لەنامەی پێشوو نووسیبوم ئاخر تۆ دە ساڵ لە من گەورەتری و جیاوازیەکی زۆر لە نێوان تەمەنمان هەیە، جگە لەوەی تۆ خێزانداری و چەند منداڵێکیشت هەیە، با ئەوەشت بهێنمەوە بیر کە سیلەی خزمایەتی لە نێوانمان هەیە، گەر واز نەهێنی ناچارم باوك و براکانم ئاگادار بکەمەوە، تکا دەکەم ئەم نامەیە بە گرنگ بزانە و

دوا نامە و دوا وەڵامی منە.

کەمێك دوای بانگی ئێوارە مامۆستا شەکراومان بە بێهۆشی گەیاندە ژوورێکی نهۆمی سێ، دەرگامان لە سەری داخست، هەر ئەو شەوە ئەمیر و ئەبوو حەنیفەش هاتن و لە نهۆمی سێیەم لەگەڵ ئەمیر دانیشتن و خواردنیشیان بۆ هێنابوو. وا دەهاتە بەرچاو دانیشتنەکەیان تایبەت بووبێ بە ڕفاندنی مامۆستا شەکراوەوە.

دوو شەوی دوای ئەوە، نۆرە دەوامی خۆم و تیمەکەم بوو، کات لە دوانزەی شەو تێپەڕیبوو، ئەمیر بەتەنها گەیشتە لامان، لەبەر دەرگای حەوشە لەسەر کورسیەك دانیشت و پێی گوتم: خەوم زڕاوە و لە ماڵ بێزار بووم، دەمەوێت ئەمشەو لەگەڵ ئێوە بم و لە جیاتی ئێوە ئیشکبگرم، تکام لێی کرد کە بچێتە ژورەوە و پشوو بدات، بەڵام بێسود بوو گوتی: دەبێت ئێوە پشوو بدەن و بخەون.

نەدەبوو گوێڕایەڵی نەبین و قسەی ڕەت بکەینەوە، هەرچەندە دەمزانی ماستەکە بێ موو نیە، ناچار بووین بچینە ژووری خۆمان، گڵۆپمان کوژاندەوە و برادەران لێی خەوتن، بەڵام من خەوم لێنەدەکەوت، دەمویست خەوم لێبکەوێ تا ئاگاداری هیچ بارودۆخێکی ئەو شەوەی ناو کۆشکەکە نەبم، بەڵام دڵم بە جۆرێك نائارام بوو کە خەوم لێنەکەوێت، هاوڕێکانم پرخەی خەویان دەهات و بێئاگا بوون لەوەی بۆچی ئەمیر بەم نیوەشەوە هاتۆتە لامان و دەیەوێت ئێمە بنوێنێت، چەندین جار لەناو پێخەفەکەم ئەمدیو و ئەودیوم کرد بێسود بوو.

شەو ڕاشکا، توانام نەما چیدی لەناو جێگاکەم بمێنمەوە، لە حەوشەوە تەماشای ئاسمانی بێبنم کرد، ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە، ئەستێرەیەك لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا بەخێرایی دەڕۆیشت، یەکێکی تر لەلای باکوری گۆی زەویەوە بەرەو باشور ملی نابوو. ئەو چیرۆکەم هاتەوە بیر کە نوسەرێك لەکتێبێکی خۆی دا نوسیبووی : پیاوێکی دەشتی هەولێر لە شەوێکی زستان دا باران نم نم دەباری بۆ باوکمی گێڕایەوە، پیاوەکە گوتی ساڵ ساڵی حەفتاو یەکە و وەرز هاوینە، کۆمەڵێك پیاوی ئاوایی لەماڵی عەمەدی برام لەسەر سەکۆی بەردەم خانوەکەیان دانیشتبوین، کاتێك ئەستێرەیەکی گەش بەئاسمانی مەملەکەت دا تێپەڕی، مام هۆمەر کە پێشتر پێشمەرگەی پارتی بوو هەڵیدایێ و گوتی: جەماعەت ئەو ڕووناکیە دەبینن؟ هەموان گوتیان: بەڵێ دەیبینین، مام هۆمەر گوتی: ئەوە قەمەر سناعی ئەمریکایە، مام عەلی کڵاوسوریش کە کۆنە شیوعی بوو هەڵیدایێ و گوتی: نەخێر ئەوە قەمەر سناعی ڕوسیایە نەك ئەمریکای جیهان خۆر، سەرت نەیەشێنم قسەیەك لەم قسەیەك لەو بوو بە دەنگە دەنگ و هەرا و جوێندان بە یەکتر و هێرش کردنە سەر ئەمریکا و ڕوسیا، دواجار دەنگە دەنگ و هەراو هۆریاکە هەموو میوانەکانی کردە دوو بەرەوە، بارودۆخەکە بەدەنگە دەنگ و جوێندان نەوەستا، بەڵکو سەری کێشا بۆ شەڕە گۆچان و مەترەق و داسولکە و چەند کەسێك بریندار بوون، تا عەیامێکی دوور بەینی خزمەکان چاك نەبوەوە، تا کادیرێکی پارتی و شیوعی پێکەوە هاتە گوند و هەموانیان ئاشتکردەوە.

لەناو حەوشەی کۆشکەکە ڕووەو باشوور وەستابووم، هێشتا چاوم بە ئەستێرەکانی ئاسمانەوە بوو، لەخۆم و بیرکردنەوە و تێگەیشتنەکانم بێزار بووم، هیچ دەنگێك نەدەهات جگە لە جار جار حەپەی سەگ و دەنگی کوندەپەپۆی ئەو دەشت و دەرە نەبێت، زۆر جار گوێم لە بابم ببوو دەیگوت: لەهەر شوێنێك کوندەپەپۆ خوێندی ئەو شوێنە توشی کارەسات دەبێت و چۆڵ دەکرێت، بیرو هۆشم لای ئەمیر بوو، ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکرد داخوا ئەمیر بەم نیوە شەوە بۆچی هاتوە؟ ئەی نەیگوت من پاسەوانێتی دەگرم ؟ کوا ؟ دەرگای حەوشە داخرابو، لەناو حەوشە و تەواوی نهۆمی ژێرەوە گەڕام ئەمیرم بەدینەکرد، گوێم هەڵخست هیچ دەنگێك نەدەهات، بۆچونم وابوو ئەمیر چۆتە لای مامۆستا شەکراو، پێم وابو خەوی نەزڕابوو، بەڵکو بەتایبەتی بۆ دیداری هاتبوو، هەربۆیەش ئێمەی نواند.

نازانم چۆن وەها بڕیارێکم دا بچمە نهۆمی سێیەم و بمەوێ نهێنیەکانی ئەو شەوەم بۆ دەربکەوێ، گەرچی هەستم بە مەترسی کارەکەم کردبو و ئەو ئەگەرەم لەبەر چاو بوو کاتێ ئەمیر دەمبینێ خەریکی سۆراغی ئەوم دەمباتە ناو تونێلەکە و بە فیشەکێکی دەمانچەکەی بۆ هەتاهەتایە بێدەنگم دەکات، بۆ سبەینێش ئیسماعیل ڕادەسپێرێت کە لاشەکەم پەلپەل بکەن و لە شوێنێکی دوور بمخەنە ژێر خۆڵەوە، چش لەو دڵسۆزیەی من بۆ خوا و ئیسلام و ئەمیر هەمبوو، چش لەوەی دوو منداڵم هەتیو دەکەون و هاوسەرەکەم بێوەژن دەکەوێت، لێ ترسەکە ڕێی لێنەگرتم و لەو نیوەشەوە بە پێی پەتی (تا دەنگی پێم نەیەت) بەرەو نهۆمی سێیەم لە پەیژەکە سەرکەوتم، لەسەر پایەی کۆتایی پەیژەکە گوێم هەڵخست تا بزانم لە هۆڵەکە

دانیشتوە یان هیچ نوزە و دەنگێکی دێ؟ دڵم خێرا خێرا لێی دەدا، تایەکی گەرم سەرتاپای جەستەی گرتمەوە، ئارەقەم دەردا و شڵپەی ئاوم دەهات، بەبێ چرپە گەیشتمە ناو هۆڵەکە، لە نزیك ژوورەکەی ئەمیر گوێم هەڵخست دەنگەدەنگیان دەهات، ئەمیر بەتوندی پێی دەگوت: ڕازی بیت یان نا هەر لەگەڵت دەنووم، باشتر وایە بەخۆشی خۆت تەسلیم بکەی، تکا و پاڕانەوەی مامۆستا شەکراو تەنها ئەوە بوو دەیگوت تکایە وا مەکە خوا لێت خۆشنابێ و ئەم ناپاکیەت لێ قبووڵ ناکات.

چاوی ڕاستم خستە سەر کونێکی دەرگاکە، لە بەردەم سیسەمەکە کراسە قۆڵ کورتە پەمەییەکەی مامۆستا و ژێر کراسێکی سوور و سوخمەیەکی سپی کەوتبوون، چاوم خستە سەر سیسەمەکە، ئەمیرم بە ڕووتی بینی، بە هەردوو دەستی، مامۆستا شەکراوی بەرەزەوت کردبو و ڕانی خستبوە سەر ڕانی، دەمی لەسەر مەمکی بوو.

هات وهاواری مامۆستا شەکراو هیچ لە حەزەکانی ئەمیری کەم نەدەکردەوە، بەڵکو ترسی منی کەم کردبوەوە لەوەی ئاخۆ ئەمیر بە بینینم لەتوپەتم دەکات یان نا؟ ترس بارگە و بنەی خۆی پێچابوەوە، لەو چرکەیە ئەوەی بیرم لێنەدەکردەوە مردن بوو. بینینی ئەو دیمەنە هێندەی تر ئازایەتی پێبەخشیم تا دڵۆپە خوێنی ناو ڕانی مامۆستا شەکراو نەبینم نهۆمی سێیەم بەجێنەهێڵم، لەقە فڕکێ و گریان و پاڕانەوەی مامۆستا شەکراو دیمەنێکی دڵتەزێنی پێ نیشان دام، پەڵە خوێنەکانی تك تك دەکەوتنە سەر سەرچەفە سپییەکەی ژێریان و لە ماوەیەکی کەمدا ئسفنجەکە خوێنەکەی هەڵدەمژی، ڕانی توکاوی ئەمیر

لەسەر ڕانی سپی و نەرمونۆڵی مامۆستا شەکراو لەجوڵەی بەردەوامدا بوو.

ئەی نەمگوت خۆت تەسلیم بکەی باشترە؟ ئەمیر چەند جارێك وایپێگوت.

ئیتر کاتم بەس بوو بۆ ئەوەی نهۆمی سێیەم بەجێبهێڵم و بچمەوە ناو جێگاکەم، بەس بوو بۆ ئەوەی بزانم ئەمیر لە سینە و ناو ڕانی مامۆستا شەکراو تێر بوە یان نا؟ بەس بوو بۆ ئەوەی دیمەنی خۆ تێرکردنی زیاتری ئەمیر ببینم، ئیدی دەبێ بەلایەنی کەم خۆم لە مەرگی ڕاستەقینە و بێ چەندو چوون بپارێزم، لە ناو پێخەفەکەم گینگڵم دەدا و هەست و هۆشم ئازاریان دەدام.

چەند جارێك بەخۆمم گوت: کەوابێ من پاسەوانی کەسێکی دڕندەم نەك خواپەرست، من دەستێکی زاڵمم بۆ هێنانە دی ئاوات و حەزەکانی ئەمیر و تێر کردنی ئارەزووەکانی، چەند جارێکی تر تفی خەستم لەخۆم کرد و خۆم وەك مرۆڤێکی بێڕەوشت و ڕیسوا دەهاتە بەر چاو.

بیرۆکەی کوشتنی ئەمیر و خۆ ڕادەست کردن بە دەزگاکانی ئاسایش لە مێشکم دا دەخولانەوە، دەمویست بەرەو لای تفەنگەکان بڕۆم، بەڵام ترس ڕێی لێدەگرتم.

ئەمیر دەکوژم، شار پاك دەکەمەوە لە پۆخڵی، ئەهلی شار ڕزگار دەکەم لەدەست گورگێکی برسی، بەردەوام ئەم ڕستەیە لە مێشکم دەخولایەوە، ئێستاش نازانم ناو ئەو هەموو خەم و بیرکردنەوە ئاڵۆزانەدا کەی خەوم لێکەوت، کە لە بانگەبانگی هاوڕێکانم بەئاگا هاتمەوە تیشکی ڕۆژ گەزێك یان کەمێك زیاتر بڵند بوو.

ماموستا هیوا زەقەی چاوی دەهات و لە بیرکردنەوەیەکی قوڵ دا نقوم ببوو، منیش لە ناو خەمێکی بێ بن دەتلامەوە و هەر ئەوەتەی نوزەم دەهات، بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ژوورەکەدا، هەردوکمان ئازارمان دەچەشت، من بۆ ئەو تاوانانەی ئەنجامم دابو و بە درێژایی دوو ساڵ هۆش و هەستی بەرەزەوت کردبوم و جڵەوی بیرکردنەوەی لێسەندبوم و ئیرادە و وزە و تواناکانمی خستبوە خزمەتی تاقمێکی تەکفیری و زاڵم، ئەویش بۆ نەهامەتیەکانی گەلەکەی کە چۆن کۆمەڵێك خەڵك گورگ ئاسا لەژێر سێبەری ئاین نەزانی و لاوازی دەبەنگەکان دەقۆزنەوە و دەیانکەن بەئامرازی هێنانەدی خەونە پوچەکانیان و چۆن حەزەکانیان خاڵی دەکەنەوە.

(٦)

لەسێیەم ڕۆژی دیدەنیەکەی من و مامۆستا هیوا، بەم شێوەیە دەستم بە قسان کرد:

شار بەتەواوی نائارام دەهاتە بەرچاو، هەواڵی کوژرانی چەندین کەس لەناو خەڵك بڵاو ببوەوە، لەیەك مانگ دا چەندین پرسە لەگەڕەکە جیاجیاکان هەبوون بێ ئەوەی بزانن بکوژەکان کێن و چ کارەن، ئەمیر و تەواوی گروپەکەمان لەڕێگەی لایەنگرانی خۆمانەوە هەواڵی کوژران و شوێن بزرکردنی چەندین کەسمان دەخستە پاڵ حزبەکانی دەسەڵات تا خەڵك لێیان بێدەنگ نەبێت و کاردانەوە نیشان بدەن و پشێوی بنێنەوە.

لەماوەی دوو مانگ دا مەلایەك و مامۆستایەکی مەسیحی و دوو منداڵی شەش حەوتساڵە و سێ مێردمنداڵ و دوو ژن کوژران و چەندین کەس بزر بوون و چارەنوسیان نادیار بوو، چەند دوکانێکی مەی فرۆشتن و سەرتاشی و بوك ڕازاندنەوە سوتێنران، شەوانە لەخانوەکەی ئەبوو حەنیفە و ئەمیر کۆدەبوینەوە و قاقا پێدەکەنین و خۆشحاڵی خۆمان لەئەنجامدانی کردەوەکان دەردەبڕی، هەموو ئەوانەی لەوێ بوون و لایەنگر و مجاهد بوون، لەڕاستیدا بێئاگا بوون لەوەی چی دەگوزەرێت و کردەوە و ئامانجی گروپەکەیان بۆ دەرنەدەکەوت و وایاندەزانی ئەو کارانەی کە ئەنجام دەدرێن لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان بڕیاریان لەسەر دراوە، پێکەنینەکانی من ژەهراوی

بوون، سیخناخ بوو له فێڵ لەخۆکردن، تەنانەت ئەوانیشم بە پێکەنینەکانم خەڵەتاندبوو، تا وا تێبگەن منیش وەك ئەوان بێئاگام، من ڕاستیەکانم دەزانی و بەچاوەکانی خۆم دەمبینین، بەڵام ئەوان مەست بوون بە دەق و سوننەت و دەعواکان، خەواڵوو کرابوون بە بێئاگایی و هەموو هەستەکانیان سڕ کرابوون وەك چۆن پێشتر منیان مەست کردبوو. لاتان وانەبێت مرۆڤ تەنها بە جۆرەکانی مەی مەست دەبێت، بەڵکو هەڵە تێگەیشتن لە ئاینیش ڕێگە و ئامرازێکە بۆ مەست کردن و بێئاگایی و زۆر جار بەرەو تاوان پەلکێشت دەکات گەر ڕۆشنبیری گشتی و ڕۆشنبیری ئاینیت لەئاستێکی نزم دا بێت.

دوو لەوانەی شوێنبزر کرابوون سەفیەی هاوسەری ئەبوو حەنیفە و دڵخوازەکەی بوو دوای ئەوەی ئەبوو حەنیفە سەبارەت بە سەفیە و خوشکەزاکەی هەموو ڕاستیەکانی بۆ دەرکەوت، براکانی سەفیەی لێ ئاگادار کردەوە، ئەوانیش بە کۆی دەنگ بڕیاریان دا هەردووکیان بکوژرێن.

شەوێکیان ئەبوو حەنیفە لە ماڵی خۆیان هەردووکیانی بێهۆش کرد، دواتر هەردووکیانی هێنایە باڵەخانەکەی خۆی، من و ئیسماعیلی ڕاسپاد لەناویانببەین، ئەرکی کوشتنی ئەم دوو دڵخوازە لای من ئاسان بیوو لەبەر دوو هۆ، یەکەم: لەڕوانگەی ئاینەوە ئەوەی ناپاکی بکات شەرعیەت بە کوشتنیان دەدرێت، دووەم: ڕاهاتبووم لەسەر کوشتن و لێدان و توندوتیژیەکان و سڵم لێنەدەکردەوە و ترسم نەمابوو.

بەرەبەیان خوشکەزاکەی ئەبوو حەنیفەمان بردەوە ناو حەمامەکە، سەرمانبڕی دواتر پەلپەلمان کرد، ئنجا سەفیەشمان

بەهەمان ڕێگا کوشت و جەستەی پەلپەل کراوی هەردووکیانمان خستە ناو کیسەی نایلۆنەوە و لە دەرەوەی شار خستمانە ژێر زەوی.

مامۆستا هیوا لێی پرسیم : کە دەتزانی ئەو کارانەی پێت ئەنجام دەدرێت کاری قێزەون و ناپەسەندن و فەرمان و ڕەزامەندی خودای لەسەر نیە، بەڵکو تاوانگەلی گەورەن دەرهەق بە مسوڵمانان و خەڵکی شارەکەت ئەنجامی دەدەی، دەشتزانی کارەکانتان ئاکامی خراپی دەبێت ئەدی بۆچی هەوڵی دوورکەوتنەوە و ڕاکردنت نەدا؟

تەماشایەکی ناو چاوی مامۆستا هیوام کرد و هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی، گوتم: ئەو ماوەیەی کە دەمتوانی وازیان لێبهێنم و لێیان دوور بکەومەوە هێشتا باش لێیان تێنەگەیشتبووم و باشم نەدەناسین، وامدەزانی ئەمیر جێنشینی خەلیفەکانی ڕاشدینە و هاوکارەکانیشی سەحابەن، کاتێك ئەوانم ناسی و زانیم چین و کێن بوارم نەما لێیان دوور بکەومەوە، دواتر مامۆستا بۆ کوێ ڕابکەم خۆ بۆ هەر شوێنێك ڕامبکردایە دەیانکوشتم، یەکێك لەوانەی لێمان دوورکەوتەوە و شاری هەولێری جێهێشت و لەشاری سلێمانی گیرسایەوە، ئەبوو عەبدوڵا ناوێك بوو لەنیوە شەوێك دا لەناوماڵەکەی خۆی کوشتیان، لەکاتی کوشتنەکەی وێنەیان گرتبوو، وێنەی لاشەی لەخوێن گەوزاوی ئەبوو عەبدوڵایان بەهەموو مجاهیدەکان نیشان دەدا، دەیانگوت: ئەمە چارەنووسی هەر کەسێکە لە ئاینی ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، بەمەش ترسیان خستە دڵی هەموان، تا بەهیچ شێوەیەك بیر لەڕاکردن و دوورکەوتنەوە نەکەینەوە،

کە وێنەکەشیان نیشاندەداین مەبەستی سەرەکیان ئەوە بوو بەو وێنە ترسهێنەرانە پێمان بڵێن: نەکەن وەکو ئەبوو عەبدوڵا دژمان بوەستنەوە، ئەگینا هەمان چارەنوسی ئەوتان دەبێت، بەڵام لە ڕواڵەت دا پێیان دەگوتین : لە تاغوتەکان نەترسێن ئەوەتا خودا ڕێگە لەوانە دەگرێ کە دەیانەوێ ببن بە مەترسی بۆ سەر ژیان و سەلامەتیتان، لەهەمووی مەترسیدارتر ئەوە بوو کارێکی کوشتنیان پێ ئەنجام دەدایت، تاکو وەك خۆیان تاوانێکی گەورەت لە ئەستۆ بێت و نەتوانی پەیوەندی بەدەزگا ئەمنیەکانی وڵاتەوە بکەیت، وەکو ئەوەی من کە ئیسماعیل دوای کوشتنی گەنجەکە پێی گوتم ئەوە بزانە کە ئەم کوشتنە بە کامێرا تۆمار کراوە .

مامۆستا هیوا بەم چیرۆکەی من، چیرۆکەکانی نەجیبی هاتەوە یاد، گوتی: چەند ساڵ دوای گەیشتنی بەفەرەنسا نەجیب سەردانی هەرێمی کوردستان دەکات و دەیەوێت لەوێوە کەسوکارەکەی ببینێت و بەدیداریان شاد بێت، دوای گەڕانەوەی کەسوکارەکەی بۆ ئێران عەسرانێك دەچێتە ناو باخچەی شار هەر بە ڕێککەوت لەباخچەکە لەگەڵ کچێك دەکەوێتە گفتوگۆ.

نەجیب بۆیگێڕامەوە و گوتی: وام هەست دەکرد کە ئەم کچەم لە شوێنی تر بینیبێ، لێمپرسی تۆش لە فەرەنسا نیت؟ کچەکە بە پێکەنینەوە گوتی نەخێر، خۆزگە لەفەرەنسا دەبووم.

گوتم: وا هەست دەکەم تۆم بینیبێ یان ڕۆژگارێك ئاشنای یەکدی بووبین.

بەشۆخیەوە گوتی: ڕەنگە هەستەکانت بە هەڵەیان بردبی.

پێموابوو هەستەکانم زانیاری هەڵەی پێنەداوم، بۆیە بە جۆرێك لە دڵنیاییەوە گوتم: نا هەستەکانم ڕێی هەڵەم پێنیشان نادەن.

یەکسەر گوتی: ئاخر من خەڵکی گوندی ( چەقێن ) ی ئەودیووم، هیچ شتێك شك نابەم پێکەوە گرێی دابین تا کردبێتین بە ئاشنای یەکتر.

بەسەرسووڕمان و لەبەرخۆمەوە گوتم:

-چەقێن؟

من لەیادەوەریەکانی خۆم دا ناوی گوندی ( چەقێن )م تۆمار کردبوو کە شەوێك دوای گەیشتنم بە سەرسنوور لە ماڵە هەژارێکی خوارووی ئاوایی گوندەکە مابومەوە، دەمویست بیهێنمەوە یادی خۆم کە لەکوێ ئەم کچەم بینیوە، چوونکە دڵنیابووم لەیادەوەریەکانی مێشکم جێیەکی هەبوو.

ئای خوایە لەم ڕێککەوتە، دەبێ ئەم کچەم لە گوندی چەقێن نەبینیبێ؟ لەدڵی خۆم دا وامگوت.

چەند دەقیقەیەك بیرم لێدەکردەوە و لە خۆمم پرسی: دەبێ لە ماڵی خانەخوێکەی چەقێن ئەم کچەم بینیبێ؟ وەڵامی خۆمم دەدایەوە: نا ئەو ژن و پیاوە تەنها یەك منداڵیان هەبوو.

لەگەڵ خۆم دەدوام و بۆ ڕابردووی ژیانی خۆم گەڕامەوە، شاری بۆکان و شارەکانی باشوور و وڵاتی فەرەنساشم هێنایەوە یاد، هێندە گفتوگۆم لەگەڵ خۆم کرد، تا بەخۆم بڵێم: هەوە، هەر ئەو ژنەیە کە کوڕە لەڕو لاوازەکەی فڕێدایە ناو ڕووبارەکەوە.

گوتم: هەوی.

بەپێکەنینەوە گوتی: کێم؟ منت دۆزیەوە؟

گوتم: سەد لەسەد.

-دەی کێم؟

لێم پرسی: بۆ وات کرد خۆ لە مەبەستم تێدەگەی؟ دەزانی من کێم؟ ئەوەم کە دە دوانزە ساڵێك پێش ئێستا لەدەم ڕووبارەکەی گوندی چەقێن تۆم بینی کە چیتکرد.

کچێکی سوورەی چاوشینی پرچ زەرد، کەڵەگەت و ناوقەد باریك لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو، دەتگوت لەچاوەڕوانی کەسێك دایە، لەکەسێکی وەرزشی دەچوو هێندە جەستەی ڕێك بوو، جانتاکەی بەملی دا شۆڕ کردبووەوە نەك بەقۆڵی دا، کاوبۆکەی لەو مۆدێلانە بوو کە لە چەند شوێنێکەوە دڕاوی پێوە بوو، ئاهێکی هەڵکێشا، لەئاهی کەسێکی غەدرلێکراو دەچوو، بە بیستنی ئەم هەواڵە ڕاچەڵەکی.

گوتی: تۆ چیت پۆلیس یان ئاسایش؟

-هیچیان، من لە فەرەنسا دەژیم.

-چۆنت زانی من ئەوم؟

-ئەو چرکەیەی تۆ پاڵت بە پیاوەکەوە نا من لەدەم ڕووبارەکە بوم.

-شوان بووی؟

-نا بۆ باشوور دەهاتم، لەودیو بڕیاری گرتنم بۆ دەرچوبوو.

-کەوابێ هەردووکمان خەڵکی ئەودیوین.

-تۆش؟

-بەڵێ منیش خەڵکی ئەودیوم.

-بۆ وات کرد ؟

-چۆن دڵنیام دەکەیتەوە کە پۆلیس نیت؟

چومە بەردەمی و ناسنامە فەرەنسیەکەم خستە ناو چنگی، گوتم: ئەوەتا من کوردێکی فەرەنسیم، بەڵێن بێت نهێنیەکانت بپارێزم.

-خەڵکی کام شاری؟

ئەمجارە ناسنامە ئێرانیەکەم پێدا، لەوە دڵنیا بوەوە کە خەڵکی شاری بۆکانم و دوورم لەو ناوچەیەی ئەوان کە گومانی دەکرد یەکێك بم لەئەندامانی بنەماڵەی پیاوەکەی ئنجا گوتی: پێمخۆشە لەم بێدەنگییە ڕزگارم بێت، تۆ یەکەم کەسیت بەدەنگت هێنام، حەز دەکەم چیرۆکەکەم بنوسرێتەوە و لە دیواری هەموو ماڵێك هەڵواسرێت، تا هەموو دنیا بزانێ دابونەریت چ غەدرێکی لێکردم، ئەوەش بزانن من چ غەدرێکم لەو پیاوە کرد، بەڵام ترسم لەوە هەیە لەبەین ببرێم، بۆیە داوات لێدەکەم نهێنیەکانم بپارێزیت.

کاتی خۆی برایەکم لە گوندی چەقێن شوان بوو، براکەم دڵی دەچێ بەکچی ئاغاکەی دا، پاش کەین و بەین و تەگبیر کچەکە

هەڵدەگرێت و ئیدی هەردووکیان لەچاوان ون بوون، تەنانەت ئێستاش کەس نازانێت لەکوێ دەژین، ئایا لە ژیان ماون یان نا؟ هەردوولا ماڵە باوانی کچەکە و ئێمە بوینە دووژمندار، پیاوماقوڵانی هەردوو دیو داوایان لەهەردوو بنەماڵە کرد کۆتایی بەو دوژمنایەتیە بهێنن، دوای چەندین دانیشتنی پیاوانی ڕیش سپی و پیاوماقوڵان، هەردوولا پێکهاتنەوە، بەڵام من بوومە قوربانی ئەو پێکهاتنەوەیە و بەزۆر درام بە برایەکی کچەکە، ئەوەی خستمە ئاوەکەوە ئەو کوڕە بوو کە منیان بە زۆرەملێ کردە ژنی.

بەر لەوەی براکەم کچی ئاغاکەی هەڵبگرێت، کوڕێکی گوندەکەی خۆمانم خۆشدەویست و بەڵێنم پێدابوو کە بێتە خوازبێنیم ڕازی بم و شووی پێبکەم، بۆ ماوەی ساڵێك پەیوەندی بەتینم لەگەڵی دروست کرد و چەندین جار لەماڵی خۆمان و لەدەشت ودەر ژوانمان ڕێکدەخست، هەموو جارەکان بەڵێنمان بۆ یەکتر دووپات دەکردەوە و تەنانەت بەشێوەیەك ئاوێتەی یەکدی بووین کە نەتوانین دەست لەیەکتری هەڵگرین، من چەند ئەوم خۆشدەویست ئەویش سەد هێندە منی خۆشدەویست، لەناو ئشق و خۆشەویستی ئەو کوڕەدا توابومەوە، بەجۆرێك نەتوانم لەگەڵ هیچ کەسی تر ئەو پەیوەندیەم هەبێ و لەداهاتودا خێزان پێکەوە بنێم، زۆربەی شەوان خەونم پێوە دەبینی، خەونەکانم ببوون بە هێز و وزە، بە خەونەکانم دەژیام و هەناسەم دەدا و ڕۆژانە کارم پێدەکرا، خەونەکانم دڵخۆشییان پێبەخشیبوم، دەمویست هەموو شەوان هەزاران خەونی پێوە ببینم.

پێموابوو جگە لەو ناتوانم ژیان لەگەڵ کەسی تر بەرێبکەم، ئەو ببوو بە باشترین بنیادەم بۆم.

تکام لەباوکم کرد نەمکات بەقوربانی ئەو پێکهاتنە، لەبری من بە پوڵ ڕازیان بکات، بەڵام باوکم گوتی: خۆم بەپیاو دەزانم و هەرگیز لەقسەی خۆم پاشگەز نابمەوە، لای دایکم هەڕەشەی خۆکوشتن و خۆسوتاندنم کرد، پێمگوت ڕۆژێك شوان و گاوان هەواڵتان دەدەنێ کە قەڵ و داڵ لەو دەشتودەرە لەتەرمی کچەکەتان ئاڵاون، بەڵام هەڕەشەکانم دادی نەدام و هیچ لە بڕیارەکەی باوکمی نەگۆڕی، تا دواجار بەجلی خۆمەوە لەو ڕووبارە بەفراویە هەر لەو شوێنەی ئەوم خستە ناو ڕووبارەکەوە بەچاوی پڕ لەفرمێسك و دڵێکی پڕ لەخەم و پەژارەوە منیان پەڕاندەوە بۆ چەقێن و لەژوورێکی تاریك کرام بە بوك، ئەو ژوورە و تەنانەت تەواوی چەقێنیش بۆ من وەك دۆزەخ وابوو، کە تیایدا سەرتاپای هیوا و یادەوەریەکانی ژیان و ئایندەمی کردە دەسکێك پوش و پەڵاش و بە چەخماخەیەك ئاگری لێبەردرا، بەمەش ویژدان و هەست و بیرو هۆشمیشی سووتاند، کردمی بەمرۆڤێکی دڕندە و بێ هۆش و هەست.

شەوی یەکەم خۆم نەدا بەدەستەوە، وەك منداڵێکی هەشت نۆ ساڵە دەگریام و دەپاڕامەوە کە دەستم لێنەدات، هەرچەندە ڕاز و نهێنی و پەیوەندیە خۆشەویستیەکەی خۆمم بۆ ئاشکرا نەکرد، لەناخمدا حەشارم دا، ئەویش لەڕ و لاواز و بێدەسەڵات دەهاتە بەرچاو، کە نەتوانێ بە هێز و بازووی ناچارم بکات ببم بە بوکێکی ڕامکراو، تەنها هەڕەشەی لەدەست دەهات، پێی گوتم: تۆ لە سولح دا لەبری خوشکم دراوی بە من، گەر خۆت

نەدەیت بەدەستەوە، ئەو پێکهاتنە هەڵدەوەشێتەوە.

شەوی دووەم دیسانەوە خۆم نەدا بەدەستەوە و پێمگوت دەستم لێبدەی خۆم دەسوتێنم، تا نیوەشەو هەوڵی پێوەدام بۆ ئەوەی خۆمی بۆ ئامادە بکەم، بەڵام نەمکرد، کاتژمێر لە دووی شەو تێپەڕی بوو بە نائومێدی و خەمێکی زۆرەوە لەسەر دۆشەکەکەی پاڵکەوتبوو، لە ناکاو گیانی کەوتە لەرزین و دەست و لاقەکانی لەکار کەوتن، زمانی گیرا و هێواش هێواش دەمی خوار بوو، هەواڵم گەیاندە خەسوم، هەر ئەو شەوە گەیاندمانە نەخۆشخانە، بۆ ماوەی سێ مانگ چەندین دکتۆریان پێکرد، بەڵام نەچووەوە دۆخی جارانی و دەست و لاقێکی بەباشی کاریان نەدەکرد.

لەو ماوەیەدا پیاوەکەم وەك کەسێکی بێ گیان دەردەکەوت، زمانی لەکار کەوتبو و توانای قسە کردنی نەمابوو، کەم نانی پێدەخورا، توانای ڕۆیشتنی کەم ببووەوە، زۆر جارم خۆم ئاو و خواردنم دەخستە دەمیەوە، بەڵام خواردنەکە بەلچ و لێوی دا دەهاتنەوە خوارەوە، هەردووکمان لەبیرمان چوبوەوە کە ژن و مێردین، ئەو هەمیشە تەماشای دەکردم ، لە ڕوخسارم ورد دەبوویەوە، دەمزانی سەدان قسەی پێیە، بەڵام نەیدەتوانی دەریانببڕێت، زۆر جار دەمبینی فرمێسك لەچاوەکانی دەهاتنە خوارەوە هەرچەندە دەیویست لەمنی بشارێتەوە و هەوڵی دەدا لەبەردەمم لاواز دەرنەکەوێت.

عەسری ئەو ڕۆژە بە ئامـاژە تێمگەیاند کە بیبەمە سەر ڕووبارەکە و تەماشای کەف و کوڵ و جوانی ڕووبار بکات و گوێ لە هاژە و خوڕەی ئاوەکە بگرێت، ئیدی پلانی لەناوبردنیم داڕشت، ویستی

دەستی بگرم تاکو یارمەتی بدەم لەڕۆیشتن، بە خۆمم گوت: با دوا چرکەکانی ژیانی بە دڵخۆشی بباتە سەر، هەوایەکی پاك هەڵمژێت و دیمەنی دەم ڕووباری پێ نیشان بدەم.

دواجار شەیتان پێیگوتم: دەی کاتی تەواو کردنی پلانەکەتە، ئیدی فڕێمدایە ناو ڕووبارەکەوە و بۆ هەتا هەتایە چاوەکانی لێکنا.

دوو هەفتە دوای تەواو بوونی پرسەکەی، منیان خستە ژوورێکەوە و پەنجەی تۆمەتیان بۆ درێژ کردم، هەموو گومانەکانیان لەسەرم کۆکردەوە، زۆریان لێدام، سەرم شکا، خوێن لە دەم و کەپوم دەهات، گەرچی سوێندم دەخوارد کە ئاگام لەو ڕووداوە نیە، بەڵام باوەڕیان پێنەکردم و سور دەیانزانی بکوژی کوڕەکەیانم.

تا مانگێك زیاتر حاڵم پەرێشان بوو، دار چەند لەسەر سەگ بوو هێندەش لەسەر من، تا دواجار بڕیاری هەڵاتنم دا، ئیدی لێرە گیرسامەوە.

-لەم ڕووداوانە خۆت بەتاوانبار دەزانی؟

-بێگومان تاوانبارم، دەبوو ڕێی ڕاکردنم بگرتایەتە بەر نەك کوشتنی.

-ئێستا ژیانت چۆن دەگوزەرێت؟

- باشم، کاری مۆدێل و سەما کردن ئەنجام دەدەم و سەرپەرشتی هێنانی کچان و و فێرکردنی سەمایانم لە ئەستۆ گرتوە، هەروەها لەڕێگەی پەیوەندیەکانمەوە گروپی کچانی بیانی دەهێنمە ئێرە،

بەمەش ژیانم زۆر باش بوە.

مامۆستا هیوا بەوەندە قسەیە پشویەکی باشی بە من دا، پاشان داوای لێکردم دەستبکەم بەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی ژیانم، منیش بەم شێوەیە درێژەم بە گێڕانەوەکانم دا :

-لەکوشتنی مامۆستایەکی ئاینی، ژنێکی هاوسێیان ئاگادار دەبێتەوە و یەك لە بکوژەکان دەناسێتەوە، بۆ ئەوەی هەواڵ نەگەیەنێتە ئاسایش و پۆلیس هەر ئەو شەوە ژنەکەشیان کوشت، بەوە کێشەیەکی گەورەیان لە نێوان هەردوو بنەماڵەکە دروست کردو ئەو پرسیارەی ورژاند: بۆچی لەیەك کات دا مەلایەك و ژنێکی هاوسێیان کوژران؟

مەلا سامان لە زۆربەی وتارەکانی دا ئاماژەی بە فیرقەکانی ئیسلام دەدا، تەکفیرییەکانی بە دۆزەخی ناو دەبرد بۆیە، بڕیاری کوشتنی درا، دوای نوێژی بەیانی کە لەمزگەوت دەگەڕێتەوە، لەبەردەم دەرگای حەوشەی خۆیان لەلایەن گروپێکمانەوە کوژرا، دەمەدەمی ئێوارەی هەمان ڕۆژ لەلایەن هەمان تیمەوە ژنەکەش لەبەردەمی ماڵی خۆیان کوژرا.

بەرەبەیانێکی تر سەرتاپای شارمان بە ئاڵای ڕەش ڕازاندەوە، دەزگا ئەمنییەکان سەریان سوڕمابوو لەم کردەیە، هیچ زانیارییەکیان دەستنەدەکەوت، کار گەیشتە ئەوەی هێزەکانی ئاسایش بۆ ماوەیەکی درێژ لەباڵەخانە بەرزەکانەوە لەبۆسەدا بن، تا لە ئەگەری سێبارە دانانەوەی ئاڵای ڕەش بتوانن بکەرەکان دەستگیر بکەن و کەسانی پشتی کردەوەکەیان پێ ئاشکرا بکەن.

مامۆستا هیوا مەراقی بوو بزانێ چارەنوسی مامۆستا شەکراو

بەکوێ گەیشت، پرسیاری چارەنوسی لێکردمەوە، گەر لەبەر خاتری کاکم یاسین و مامۆستاکە نەبوایە حەزم نەدەکرد ئەو تاوانانە بهێنمەوە بیرم، بەڵکو حەزم دەکرد هەر لەبیرم نەمێنێ، بۆیەش لەکاتی گێڕانەوەی هەندێك بێحەوسەڵە دەردەکەوتم، مامۆستا هیواش هەستی پێدەکردم، زۆرجار لەکاتی گێڕانەوەی یاداشتەکانی ئەو دوو ساڵەم دا فرمێسك لەچاوەکانم دەهاتە خوارەوە، هەندێك جاریش بەکوڵ دەگریام بەجۆرێك هەنسك و گریان ڕێمنەدەدەن هیچ قسەیەکم پێبکرێت، بەڵام نەدەکرا بۆ مامۆستای نەگێڕمەوە هیچ نا لەبەر خاتری کاکم یاسین، چونکە کاکم پشت و پەنام بوو، گەر ئەو نەبوایە منداڵەکانم لەبرسا دەمردن، بۆیە بەهەنسکەوە بۆ مامۆستا هیوا دەستم کرد بەتەواو کردنی گێڕانەوەی ڕووداوەکان، گوتم:

-خۆزگە منیش وەك ئەمیر و ئەبوو حەنیفە و ئیسماعیل لەسێدارە بدرابام، خۆزگە نەدەمامە ئەمڕۆ تاکو گێلی و دەبەنگی خۆمت بۆ باس بکەم مامۆستا گیان، خۆ منیش وەك ئەوان تاوانبارم و دەستم هەبوە لە کوشتنی خەڵك، تاکە جیاوازییەك لەنێوان من و ئەوان دا هەبوبێ ئەوەیە ئەوان لەپێناوی خودا نەدەجنگان و خەڵکیان نەدەکوشت و نەخەڵەتێنرابوون، هەرچی من و هاوبیرەکانمە واماندەزانی کوشتنی خەڵك واجبێکی ئاینیە.

مامۆستا شەکراو بوە قوربانی حەزەکانی ئەمیر، شەوێك دوای ئەوەی لەکونی دەرگاکەوە ئەمیرم بینی کە بەزۆرداری لاقەی کرد فەرمانیان دا لەدەرەوەی شار بکوژرێت و تەرمەکەی ژێرخاك بنرێت، گەرچی من نەمکوشت، بەڵام ئەرکی پاسەوانێتی ئیسماعیل و کوڕێکی ترم گرتە ئەستۆ کە بەدەمانچەی بێدەنگ

دوو فیشەکیان لەسەری دا، بۆ هەتا هەتایە بێدەنگیان کرد و ئیدی نەیتوانی وانەی زمانی کوردی بەقوتابیەکانی بڵێتەوە، من دەمزانی بۆچی مامۆستا شەکراو کوژرا، بەڵام نە ئیسماعیل و نە هاوڕێکەی ترمان ئەوەیان نەدەزانی، بەڵکو وایاندەزانی لەسەر ئەوە بڕیاری کوشتنی دراوە کە پێچەوانەی شەرع مامەڵەی کردوە.

هەمیشە پرسیارەکانی خۆمم ئاراستەی ئیسماعیل دەکرد، بەتایبەتی ئەو پرسیارانەی گرێکوێرە بوون لە لام، دیسانەوە لە هۆکاری کوشتنی مامۆستا شەکراوم پرسی، گەرچی دەمزانی بۆچی کوشتیان، بەڵام دوای ئەوەی بێدار بومەوە و زانیم ئەمان گروپێکی تەکفیرین، حەزم دەکرد لەڕێگەی وەڵامەکانی خۆیەوە باشتر ئیسماعیل بناسم و بزانم وەك من بە دەبەنگی تێکەڵ بەکاری گروپەکە بوە یان ئەویش وەکو ئەمیر و ئەبوو حەنیفە خاوەنی ئامانجی سیاسیە، دەشزانێ ئەوەی ئەنجامی دەدەن دووره لە ڕەوشتی گشتی ئیسلام، ئیسماعیل لەهەردوو جۆرەکە بوو، هەم خەڵەتێنرابو و کرابوو بە ئامراز، هەم دەیزانی کردەوەکانیان جێگەی ڕەزامەندی خودا نیە.

پێی گوتم: مامۆستا شەکراو شەکراوی ناو کۆمەڵگە نەبوو، بەڵکو ژەهرێکی کوشندە بوو.

لەناخەوە گاڵتەم بە وەڵامەکەی دەهات، حەزم دەکرد بزانێ کە منیش دەزانم ئەوان کێن، بەڵام نەمدەتوانی ڕاستییەکانی ناخمی بۆ ئاشکرا بکەم، چوونکە دوور نەبوو لەپێناوی سەلامەتی خۆیان بە دەمانچە بێدەنگەکە لەو پێدەشتەی هەولێر منیش بکوژن.

چ کارەساتێکە باوەڕت بەڕێ و ڕێبازێك نەبێت و تیایدا کار بکەیت و بۆی تێبکۆشی و ئامانجەکانی بهێنیتە دی و خۆتی بۆ بکەی بەقوربانی، چ سامناکە سوور بزانی ئەوەی ئەنجامی دەدەیت تاوانە، کەچی نەتوانی ئەنجامی نەدەیت.

لەو ماوەیە لای ئەمیر متمانەیەکی زۆرم پەیدا کردبوو، دەیویست زیاتر لە جاران لێی نزیك ببمەوە، ڕاستیەکەی گومانم لەم هەنگاوەی هەبوو، ترسم لێنیشت لەوەی مەبەستی ئەوە بێ لە ڕێگەی بەهێزکردنی ئەم پەیوەندیە خێزانیەوە بگات بەسارای خێزانم.

لەم بەدگومانیەم چ ناحەقم نەبوو، لەبەر ئەوەی یەك لە ئامانجەکانی ئەمیر گەیشتن بوو بە ژنی شۆخ وشەنگ و جوان، بەڵگەشم هەبوو کە وێنەی خێزانی ئەبوو حەنیفە و ئیسماعیل و دەیان مجاهیدی تر لەناو ئەلبومە تایبەتیەکەی هەڵگرتبو و بەسەرسامیەوە لە وێنەکانیانی دەڕوانی، لە کەلەبەری دەرگای ژوورەکەی خۆی ئەمەم بەچاوی خۆم بینی، بەڵگەی قێزەونتریشم لا بوو کە ژیانم پڕ بکات لە گومان و لەو هەنگاوانە بترسم کە دەیویست لێوەی نزیك بم.

ئەوەی بەکارەسات و تاوانێکی گەورەم زانی ئەوە بوو جارێکیان ئامینەی خێزانی ئیسماعیلمان بە فێڵێك بۆ ئەمیر بردە خانوە تایبەتەکەی، لە کاتێکدا ئیسماعیل چوبوە عەمرە، گەرچی نازانم ئەمیر چیلێکرد، بەڵام ئامینەمان بە بارودۆخێکی دەروونی خراپ گەڕاندەوە ماڵەوە.

ئەمیر کاری سەرجێیی لەگەڵ خێزانی زۆربەی ئەوانە کردبوو

کە لە ڕێکخراوەکەی بەرپرسیارێتیان پێدرابوو، بۆ ئەوەی هەر کات پێچەوانەی پلانەکانی خۆی هەڵسوکەوتیان کرد، گرتەی خەوتنەکەی بکاتە ئامرازی هەڕەشە لەسەریان و نەتوانن لێی هەڵبگەڕێنەوە، جارێك کچێکی یانزە ساڵانیان بۆ ڕفاند، دوای ئەوەی حەزەکانی خۆی لێ بەتاڵ کردەوە، بەتەزوی کارەبا کوشتیان پاشان لەت لەتیان کرد و لەچاڵێك دا خستیانە ژێر خۆڵ.

ڕێکخراوەکە لە ناو شار و دەرەوەی شار چەندین شوێنی نهێنی هەبوو بۆ ڕاپەڕاندنی کار و چالاکیەکانی، لەهەر شوێنێك لەو شوێنانە ڕێوشوێنی خۆپاریزی توند گیرابوە بەر کە مەبەست لێی ئاشکرا نەبوون بوو، یەك لەو شوێنانە خانویەکی بچکۆلانە و تایبەتی بوو، جگە لەمن هیچ کەسێکی تر بەو شوێنەی نەدەزانی، ئەو خانوە ژوورێکی خەو و چێشتخانەیەك و حەمام و تەوالێتێکی تیا بوو، ئەمیر بۆ کارە تایبەتیەکانی خۆی دەچوە ئەوێ، بەتایبەتی کارە سەرجێیەکانی، هەندێك جاریش تەنها منی لەگەڵ دەبووم، ئامۆژگاری دەکردم کە نابێ هیچ کەسێك بەم شوێنە بزانێ، دەیگوت: نابێ ئەبوو حەنیفە و ئیسماعیلیش بەم شوێنە بزانن، لەپەنای ئامۆژگاری زمانی هەڕەشەشی بەکاردەهێنا، تا لای هیچ کەسێك باسی ئەم شوێنە نەکەم.

مامۆستا هیوا لە ناخەوە بۆ بارودۆخی من و هاوبیرەکانم غەمبار بوو کە خەڵەتێنرابوین و ناچار کرابووین تا ببین بە بەشێك لەو تاوانە قێزەونانەی دەرهەق بە ئەهلی شار ئەنجام درابوون، لێی پرسیم: بۆچی دەتانویست تەنها شاری هەولێر بە ئامانج بگرن؟

-بۆ یەکەم جار ئەمیر بە شێوەی ڕێکخراو بیرو تێڕوانینی بە کافر لە قەڵەمدانی خەڵکی هێنایە کوردستانەوە کاتێك دوای ساڵێك مانەوەی لە ئەفغانستان گەڕایەوە کوردستان، ئەو کاتە ئەمەم زانی کە کرامە لێپرسراوی شانەیەکی نوستوی شاری هەولێر، زۆربەی نوسراو و وانەکانی تۆرابۆرای ئەفغانستان و بیروڕاکانی سەید قوتب و بنلادن و ئبن ڕاشد و قەرزاویان بۆم وەرگێرایە سەر زمانی کوردی، گوتیان دەبێ وەك ناوی خۆت لەبەری بکەیت و لەسەر ئەم تێگەیشتنانە ئەندامان پەروەردە بکەیت.

شەوێکیان ئەمیر لەکۆشکەکەی خۆی کۆبونەوەیەکی فراوانی ئەنجام دا کە تیایدا نوێنەری شار و شارۆچکەکانی تری کوردستانی تیا بوو، بەو کۆبونەوەیە زانیم ڕێکخراوەکەمان پەلوپۆی بۆ شارەکانی تریش هاویشتوە و ڕێکخستنی هەیە و سەدان ئەندام و لایەنگریان دروست کردوە، دوای کۆبونەوەکە هەمو بابەتە وەرگێڕدراوەکانیان دایە ئەوانیش تا کاری لەسەر بکەن.

شاری هەولێر جیا لەوەی پایتەختی وڵاتە گرنگی خۆی هەبوو، یەکەم شانەی نوستویشی تیا دروست کرا کە ئەمیر دوای گەڕانەوەی لەئەفغانستان خۆی سەرپەرشتی کرد، بۆیە سەرەتا ڕێکخراوەکەمان لە هەولێر گەشەی کرد و برەوی دا بە چالاکیە فیقهی و پەروەردەیی و سیاسی و سەربازیەکانی، دواتر بە قۆناغ گوازرایەوە بۆ شارەکانی سولێمانی و دهۆکیش.

مامۆستا هیوا پێی گوتم: هیچ پرسیارت لە خۆت نەکردبوو ئایا ئەم هەمو ئۆتۆمبیل و چەك و تفاقە سەربازی و ئەم هەموو

خانو و باڵەخانە و ژێرزەمین و کارگە و کەلوپەلانە بە پارەی کێ کڕدراون و موچەی سەدان کەس لەکام خەزێنەوە دەردەچێت وەك خۆت باست کرد؟

-هەرگیز ئەم پرسیارەم بە خەیاڵ دا نەهاتبوو، بەڵام هەمیشە پێیان دەوتین لە داهاتی کارگەکانمان و زەکاتی دەوڵەمەندەکانی وڵاتانی عەرەبی و هاوکاری و دەستگیرۆیی دەوڵەمەندەکانی خۆمان کاروبارەکانمان بەڕێوە دەبەین، بەڵام ئێستا بەم پرسیارەت هەندێك شتم دێتەوە یاد، لە نووسینگە تایبەتی و نهێنیەکەی خۆی کە تەنها من پێمدەزانی، پیاوێکی تورکم دەبینی سەردانی ئەمیری دەکرد، هەموو جارەکان بۆ چەند کاتژمێرێك پێکەوە دوو بە دوو دادەنیشتن، جگە لەو چەند جارێکیش دیشداشە لەبەرم بینیوە بەنهێنی سەردانی ئەمیری دەکرد، ئێستا لەوە تێدەگەم کە دروستکردنی کارگە و چەندین خانو و باڵەخانە و دەیان ئۆتۆمبیل و سەدان پارچە چەك بە پارەی زەکاتی خەڵك مەیسەر نابێ، لەمبارەیەوە ڕەنگە ئاسایشی هەرێم زانیاری تەواویان لابێت.

مامۆستا هیوا لەبەرخۆیەوە گوتی: ڕاست دەکەیت، لەبەرپرسانی ئاسایش دەپرسم، ئەوان دانپیانانی ئەمیر و تەواوی ئەندامانی گروپەکەیان لایە.

پرسی: چۆن ئاشکرا بوون و دەستگیر کران؟

-لەماوەی ساڵێك دا سێ جار هەموو شاری هەولێرمان بە ئاڵای ڕەش داپۆشی، هەر لەو ماوانەدا چەندین کەسایەتی دیار لەشارەکە کوژران، هەندێکیش شوێنبزر کران، چەندین مارکێت

و شوێنی خانمان و دوکانی مەی فرۆشتن سوتێنران، لە هەمووی گەورەتر بەڕێوەبەرێکی گشتی و ئەفسەرێك کوژران، ئەم کردەوانە ئەو پرسیارەی لای حکومەت دروست کرد: ئەنجامدەری ئەم کردەوانە کێن؟ سەرەتا دەزگا ئەمنیەکان کردەوەکانیان دەخستە پاڵ لایەنە سیاسیە نەیارەکانی ناوخۆ، بەڵام دواتر بۆیان دەرکەوت کردەوەکان سیمایەکی توندڕەوانەی ئاینی پێوە دیارە، ئەو کاتە ئەمەم زانی کە ئەفسەری لێکۆڵەرەوەی ئاسایش بۆ ماوەی چوار کاتژمێر بێ پشوودان لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردم، دواتر ئەندامانی ڕێکخراوەکەمان لەسلێمانی و دهۆکیش دەستگیر کران، ئیتر هەموو ئەو گومانانە ڕەوینەوە کەلەسەر لایەنە سیاسییەکانی ئەمبەر و ئەوبەر هەبوو.

سەرەتای دەرکەوتن و ئاشکرا بوونمان لەدەستگیرکردنی ئەندامێکمانەوە دەستی پێکرد بەناوی بەندەر کوردی کە ڕاسپێردرا بوو لە فلکەی شێخ مەحمود لە سلێمانی تەقینەوەیەك ئەنجام بدات، تەقینەوەکە لەڕێگەی تورەکەیەکی پڕ لە باروتەوە بێت.

ڕۆژێك بەر لەوە ئەبوو عەباسیان ڕاسپاردبوو لە ناوچەی پیشەسازی هەولێر کەلای مزی کۆنەی بچووك و گەورە و وردە ئاسن بکڕێ، ئەبوو عەباس کەرەستەکانی تەسلیمی ئێمە کرد، من و ئیسماعیل و ئەبوو ئوسامە تورەکەیەکمان ئامادە کرد، کەلا و وردە ئاسنەکانمان لەگەڵ کیلۆیەك ماددەی تی ئێن تی خستە ناو تورەکەکەوە و دوو نارنجۆکیشمان پێوە لکاند، تا زۆرترین کەس پێوە بن، تورەکەکەمان لە ڕێگەی دوو پاتریەوە بەستەوە بە کۆنترۆلێکی تەقاندنەوەوە، مەبەست لەمەش گواستنەوەی

چالاکیەکانی گروپەکە بوو بۆ سلێمانی.

دوای ئەوەی ئەبوو عەباس لە دوکانەکەی پیشەسازی ڕۆیشتبوو، پۆلیسێك دەچێتە دوکانێکی هاوسێی بۆ کڕینی کەرەستەی ئۆتۆمبیل، خاوەن دوکانەکە بە پۆلیسەکەی ڕاگەیاندبوو کە گەنجۆکەیەك کەلا مزی کۆنەی لە دوکانەکەی تەنیشتی کڕیوە، لەکاتێك دا کەلا مزی کۆن بۆ هیچ کارێك سوودی لێوەرناگیرێ و پێدەچێ نیەتێکی خراپی لەپشتەوە بێت، پۆلیسەکەش دەکەوێتە گومان و ئەفسەرەکەی لەو حاڵەتە ئاگادار دەکاتەوە، ئەفسەرەکەش هەواڵەکە دەگەیەنێتە دەزگای ئاسایش، دواتر لە ڕێگەی تۆماری کامێرای دوکانەکە و دەزگای ئاسایشەوە ئەبوو عەباسیان ناسیەوە و دەسبەجێ دەستگیر کرا، دوای شەوێك لە دەستگیر کردنی دانی نا بە کردەوەکەدا.

پێش ئاشکرا بوون و دەستگیر کردنی ئەبوو عەباس، دەزگای ئاسایشی سلێمانی کەسێکیان لەناو گرووپەکەی سلێمانیمان چاندبوو، توانیبوویان تۆڕی سلێمانی ڕێکخراوەکەمان بخەنە ژێر چاودێری وردی خۆیانەوە، ئەو بەیانیەی بەندەر کوردی بەرەو سلێمانی بەڕێدەکەوێ، ئەندامە چێنراوەکەی ئاسایشی سلێمانی هەواڵی بەڕێکەوتنی بەندەر کوردی دەگەیەنێتە دەزگای ئاسایش و ئاگاداریان دەکاتەوە لەوەی بەندەر کوردی بەهاوکاری ئەبوو سەهەند ناوێك لە گروپی سلێمانی، دەیانەوێت تەقینەوەیەك لە فلکەی شێخ مەحموود ئەنجام بدەن. دوابەدوای ئاشکرا کردنی پلانەکە لەلایەن ئاسایشی هەولێر و سلێمانیەوە، دەزگای ئاسایشی گشتی بروسکەی دەستگیر کردنی نارد بۆ سەرجەم بازگەکانی دهۆك و هەولێرو سلێمانی، بەندەر کوردی بەر لەوەی

بگاتە ناو شار لە بازگەی ئاسایشی سلێمانی دەستگیر کرا.

بۆ ئەوەی ئەمیر و تەواوی ئەندامان بەنهێنی دەستگیرکردنی بەندەر کوردی و ئاشکرا بوونیان نەزانن و نەتوانن خۆیان حەشار بدەن، ئاسایشی سلێمانی تەلەفۆنێکیان بە بەندەر کرد بۆ ئەمیر و پێی گوت: تورەکە باروتەکەم بردۆتە ناو شار، بەڵام بوار زۆر کەمە بۆ تەقاندنەوەی، چوونکە هێزە ئەمنیەکان لەناو شار پەرت و بڵاون و چاوەڕێی هەلێکی گونجاو دەکەم بۆ ئەوەی تیایدا کردەوەکە ئەنجام بدەم و سەلامەتیش بم.

دوا بەدوای دەستگیر کردنی بەندەر کوردی، ئەبوو حەنیفەش لەماڵەکەی خۆی لە هەولێر بەکۆمەڵێک بەڵگەنامەوە دەستگیر کرا، بێ ئەوەی بهێڵن ئەمیر و ئیسماعیل بەو گرتنە بزانن، ئەبوو حەنیفەشیان ڕاسپارد بە تەلەفۆن پەیوەندی بکات بە ئەمیرەوە و داوای بینینی بکات بۆ ئەوەی شوێنی بزانرێت، سەرەتا ئەبوو حەنیفە ئامادە نابێ ئەمیر غافڵگیر بکات، بەڵام بەزەبری لێدان ئەو کارەی پێدەکەن، ئەبوو حەنیفە سەرجەم ناوی ڕێکخستنەکانی گروپەکەی ئاشکرا کرد و دانی نا بە تەواوی ئەو تاوانانەی کە لەماوەی ڕابردوودا ئەنجاممان دابوو.

بۆ ئەوەی تەواوی ئەندامانی گروپ دەستگیر بکرێن و بواری خۆشاردنەوە و ڕاکردنمان نەمینێت، هێزە ئاسایشیەکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆك هەماهەنگی یەکتریان کرد و زانیاریەکانیان گۆڕیەوە، لەماوەی کەمتر لە بیست و چوار کاتژمێردا تەواوی گروپەکەمان کە سەد و پەنجا کەس زیاتر بووین لە هەولێر و سلێمانی و دهۆك و شارەکانی تر دەستگیر کراین.

بەرەبەیانێك هێزێكی گەورەی ئاسایش چواردەوری باڵەخانە سێ نهۆمیەكەی گرت و داوای خۆبەدەستەوەدانی لێكردین، ئەو كاتە ئەبوو عومەر لە نۆرە پاسەوانێتی دا بوو، بە شپرزەییەوە هاتە ژورەوە و پێی گوتین ئاسایش چواردەوری گرتووین، ئێمە بە ئەبوو عومەرەوە شەش كەس بوین، بە خێرایی دەستمان دایە چەكەكانمان، بۆ چەند چركەیەك ڕامان گۆڕیەوە، من پێم گوتن: ئایا بەرگری بكەین یان خۆمان بدەین بەدەستەوە؟ هەروا گوتم ئەوە بزانن ئەگەر دە كاتژمێریش شەڕ بكەین، دواجار هەمووومان دەگیرێین و دەكوژرێین، باشتر وایە خۆمان تەسلیم بكەین، ئەبوو عومەر بە هەڵچون و تورەبونەوە گوتی: خۆبەدەستەوەدان تاوانێكی گەورەیە، هەركەسێك بیەوێ خۆی بدات بەدەستەوە لێرە دەیكوژم و دەینێرم بۆ دۆزەخ، دەبێت بجەنگین تا شەهید دەبین، ئێمە خودامان لەپشتە دڵنیام ئەمیر و برادەرانی تر فریامان دەكەون، گەر ئەوەشیان پێنەكرێت، خودا ئاگادارمان دەبێت و لەدەست تاغوتەكان ڕزگارمان دەكات.

ئەبوو عومەر خۆی گەیاندە بەر دەرگا و دەسرێژێك گوللەی بە ئاسایشەكانەوە نا، ئیدی شەڕ دەستی پێكرد، بەڵام هەر لەیەكەم كاردانەوەی كارمەندانی ئاسایش ئەبوو عومەر كوژرا. ئەبوو سەفیر لە پەنای دیواری حەوشەكەوە لولەی تفەنگەكەی بردبوە دەرەوە، ناوە ناوە فیشەكێكی ئاراستەی هێزە چەكدارەكان دەكرد و بە دەنگی ئەڵلاهو ئەكبەر ورەی دەدایە بەر خۆی.

ئەو بەرەبەیانە بەرەبەیانی كۆتایی گروپەكەمان بوو، گرمەی تەقینەوەی ئارپیجی و نارنجۆك و قرمە و تەقەی بیكەیسی و كلاشینكۆف لەگەڵ بانگی ئەو بەیانیەی مەلای مزگەوتەكان

تێکەڵ ببوو، خەڵك پەیتا پەیتا دەسنوێژیان هەڵدەگرت و بەدڵێکی پاکەوە بەرەو مزگەوت دەچوون، تا لەوێ لەگەڵ خودا لەو بەیانیەدا بدوێن و داوای ڕەحمەت و بەزەیی و خۆشبوونی لێبکەن، منیش هاوڕێی تفەنگێکی ژەنگاوی و چەند کەسێکی خۆم ئاسا کۆڵەوار و گەوج و نەفام و نەخۆش بووم، گرمەی ئاربیجی و نارنجۆکی ئەو بەرەبەیانە خورپەی خستبوە ناو دڵی زۆرێك لەوانەی لەخەو ڕاچەنیبوون، ڕەنگە چەندین منداڵیشی لەخەو ڕاچەڵەکاندبێ و تۆقبردووی کردبن.

لەو چرکە ساتە بیرم لای سارای خێزانم و هەردوو کوڕەکەم بوو، ئەوان لەخەودا بوون، خەونیان بە ژیانێکی ئەرخەوانییەوە دەبینی و هیوایان ئەوە بوو بەو بەرەبەیانە باوکیان لەپاڵیان خەوتبێ و دەستی سۆز و خۆشەویستییان بۆ درێژ بکات و بەتانیەکانیان بخاتەوە سەر شان، چاوەڕوان بوون پەنجەکانم وەك شانە بخەمە ناو پرچی ساراوە و ئەو هەستانەم لەپرچیدا خاڵی بکەمەوە کە چەند ساڵێك پێش ئێستا منی بەو گەیاند.

گەنجۆکەیەکی باریکەڵە بووم، هەموو بەیانیانێك بە عارەبانەیەك شێلمەوە بە بەردەمیماڵیان تێدەپەڕیم، سارام دەبینی بەشکۆوە بەر دەرگاکەی خۆیانی دەشووشت، کاتێك خەڵکی بەتایبەتی گەنج و هەرزەکاری من ئاسای بینیایە دەچوە ژورەوە و دەرگاکەی دادەخست، لەو هەموو هاموشۆیەم، لەو هەموو چاو تێبڕین و دیقەتەم دڵم بوو بە موگناتیسێکی گەورە و ئەوی بۆ ڕاکێشام، تا دواجار باوك و دایکمم ناردە خوازبێنی، گەرچی سارا خوێندنی تەواو نەکردبوو، بەڵام کەسێکی تێگەیشتو بوو، بە ڕفتار و هەڵسوکەوتەکانی توانی هەردووکمان

لە بۆتەی خۆشەویستیەکی ڕاستەقینەدا بتوێنێتەوە و بمانکات بەکەرەستەیەکی پاك بۆ خێزانێکی دڵگیر و بێگەرد، توانی فێرم بکات جگە لەو کەسیترم وەك هاوسەر خۆشنەوێت, دواجار بیرم لەو چرکە ساتە دەکردەوە، ئەم بەرەبەیانە بۆ هەتایە لەیەکتر دادەبڕێین و ئەو بۆتەیە دەشکێت و خۆشەویستیمان دەکات بە ئاردی ناو دڕك.

چ بەرەبەیانێك بوو؟ بۆ من سودی نەما پەندی لێوەرگرم، بەڵام بۆ زۆرێك کەس بوو بە بەرەبەیانی نەسیحەت و وانەیەکی جوانی لێوە فێر بوون، بەلایەنی کەم ئەوە فێربن نابێ ئاین بەرچاومان لێڵ بکات و ڕاستییەکانمان لێبشارێتەوە و سۆز و خۆشەویستی و ئینسانیەتمان لێبسەنێتەوە، نابێ ئاین ویژدانمان بداتە بەر چەقۆ و لەت لەتی بکات، بەڵکو ویژدانمان بداتێ، ناکرێ مرۆ کوێرانە بەچاوی بەستراوەوە خواپەرستی بکات، بەڵکو دەبێ خوا لەخۆیەوە ببینین نەك بە ناساندنی ئەم و ئەو، ئەو بەرەبەیانە بەتەواوی تێگەیشتم ئێمە گرێ کوێرەی کۆمەڵگەین.

ڕەنگ و ڕوخساری هەمووومان لە مردو دەچوو، ترس ڕۆحمانی گوشیبوو، هاکا فیشەکێك جەستەمان دەپێکێ و دەکەوین بە زەوی دا، ئیدی تەرمەکانمان دەبەنە پزیشکی دادوەری و پاش بڵاوبونەوەی هەواڵی کوژرانی تەکفیریەکان، سارا و دایك و باوك خوشك و براکانم تەرمەکەم دەبەنەوە مزگەوت و لەوێ مردوشۆرێك بەسابونی ڕەقی جەستەم لە پیسی و ئارەقە پاك دەکاتەوە، من دەبوو پێشتر مردو شۆرێك بدۆزمەوە تا مێشکی خۆمی پێپاك بکەمەوە لەو هەمو پیسی و پۆخڵییەی بەهۆی

گێلی و دەبەنگی خۆمەوە لەسەر ئەقڵم نیشتبوو، بەڵام کوا کات دەگەڕێتەوە و دەرفەتم دەدات هۆش و هەستم لەو کەرەستە بۆگەنانە پاك بکەمەوە کە منی لەخودا و خەڵك و خێزانەکەم دابڕی.

ئەبوو سەفیر پێی گوتم: بۆ تەقە ناکەی مەگەر ناتەوێ بچیتە بەهەشت؟ نە حەوسەڵەی وەڵامدانەوەم هەبوو، نە کاتیش هاوکاربوو، تا پێی بڵێم ئەرێ کوا بەهەشت بەکوشتنی خەڵك بەدەست دێت؟ گەر وابوایە ئەمیر دەهات تا لێرە خۆی بەشەهیدکردن بدات، تاکو بەوە کلیلی بەهەشتی دەستبکەوێت نەك لەترسی مەرگ بەهەشت و وتارە ئاگرینەکانی خۆی لەبیر بچێتەوە، داخوا ئێستا لە چ کونێك خۆی شاردۆتەوە و ئێمەشی کردۆتە قوربانی، بیرمە جارێك ئەمیر پێی گوتین لە هەر شوێنێك سەغڵەت کران و مەترسی کەوتە سەر ژیانتان ئەم سوورەتە بخوێنن، خوای گەورە مەلائیکەتی خێر دەنێرێت و هەڵتاندەکێشێتەوە بۆ لای خۆی، زۆر چاوەڕێمان کرد مەلائیکەتی خێر نەگەیشت.

تفەنگەکەم لەناو دەستی ڕاستم شۆڕ ببوەوە سەرەو خوار، چاوەکانم بێمەبەست کەوتبوە سەر ئەبوو سەفیر کە ناوە ناوە فیشەکێکی دەتەقاند، کاتێ ئەبوو سەفیرم بینی بەلادا کەوت، ئەوەتا پێکرا، ئێستا پێی وایە یەکەم هەنگاوی ناوە بەرەو بەهەشت ئەو بەهەشتەی ئەو لە خەیاڵ و تێگەیشتنی خۆی دا دروستی کردبوو، هەنگاوێك چوومە پێشەوە، هێواش هێواش چاوەکانی کز دەبون و پەنجەکانی دەستی سپی هەڵدەگەڕان، خوێن لە سەریەوە بەرەو سەر ڕیشی جۆگەلەی بەستبوو.

لەناو هەڵلاو هەنگامەی ئەو بەرەبەیانەدا چاوەکانم ئەبڵەق

ببوون، دەمویست چارەسەرێك بدۆزمەوە و هاوار بكەم و داوای خۆبەدەستەوە دان بكەم، كاتێك لەدواوە لولەی تفەنگێك خرایە سەر مێشكم و پێی گوتم: تفەنگەكەت دانێ.

خوای گەورە منی خۆشویست، خۆ منیش هەر ئەوەم دەویست كە بگیرێم، كارمەندانی هێزەكانی ئاسایش لەحەوشەی پشتەوە دزەیان كردبوە پشتمانەوە و لە ماوەیەكی كەم دا هەمووومانیان چەك كرد و دەستگیر كراین.

هاوكات لەگەڵ ئابلوقەدانی ئێمە، هێزەكانی ئاسایش دەستیان گرتبوو بەسەر سەرجەم خانو و كارگە و باڵەخانە و شوێنە نهێنییەكانی تر، ئیسماعیل لە ماڵی خۆی دەستگیر كرابوو، ئەمیرو كچۆڵەیەكی خەڵەتێنراو لەخانوە تایبەتەكە بێ هیچ بەرگریەك دەستگیر كرابوون.

مامۆستا هیوا لەناو ڕووداوەكانی ئەو بەرەبەیانەدا خۆی دەبینییەوە، وەك بڵێی فیلمێكی سینەمایی بێت و خۆی یەكێك بێت لەكارەكتەرەكانی و ڕۆڵی گەورەی تیا ببینێ، پێی گوتم:

-ڕووداوی خۆكوشتنەكەم بۆ بگێڕەوە، هاوڕێكەتان بۆ خۆی كوشت؟

ئەو شەوەی ئەبوو مریەم خۆی كوشت، وەك بڵێی زانیبێتمان ئەو شەوە دوا شەوی ژیانیەتی، هەموومان لە چواردەوری كۆبوینەوە، هەر لە ئێوارەوە عاجز و مەلول دیار بوو، پێشمانگوت: نەخۆشی؟ گوتی نا هیچم نیە، ژوورەكەی ئێمە هەشت بەندیی تیابوو، هەموومان یەكترمان خۆشدەویست و لە هەمان ئەو گروپە بووین كە لەسەری گیرابووین، ئێوارە كە خواردنمان بۆ هات، ئەو دەمی لێنەدا، كە چایەكەمان بۆ هات، دیسانەوە لەدەوری خڕبوینەوە و كەوتینە گاڵتە و پێكەنین

و گێچەڵمان پێدەکرد و دەمانویست هۆکاری بێتاقەتیەکەی بزانین و بە پێکەنینی بهێنین، ئەبوو محەمەد بەپێکەنینەوە هەڵیدایێ و گوتی : دەزانم بۆ نانت نەخوارد، سبەی ڕۆژی سەردانە و ماڵەوەتان خواردنی باشت بۆ دەهێنن، دەتەوێ هەر لەئێستاوە گەدەی خۆتی بۆ پڕ نەکەی، ئەبوو مریەم توانا و حەزی قسەکردنی کەم بوو، هەرچیەکمان پێبگوتایە پێکەنینی نەدەهات، سەر و دڵی گیرابو و هۆکارەکەیشیمان نەدەزانی. ئەو کاتەی بە غەڵبەغەڵب و بانگ کردن بە ئاگا هاتمەوە کاتژمێر سێی شەو بوو، بەچاوی خەواڵوەوە پرسیم: ئەوە چیبوە بۆ ناهێڵن بخەوین؟ یەك لە هاوڕێکانمان گوتی خەوی چی، ئەبوو مریەم حاڵی شڕە، بە شپرزەییەوە گوتم بۆ؟ گوتی: بە کەرتە شووشە لە تەوالێتەکە هەوڵی خۆکوشتنی داوە.

تەماشایەکی ڕوخساری ئەبوو مریەمم کرد، هەردوولا ڕومەتی سپی سپی هەڵگەڕابوون و خوێن لە جەستەی کەم ببوەوە، چاوەکانی زەق بوون دەتگوت تەماشامان دەکات، بەدەستی خۆم نەبوو بە بێدەنگی فرمێسکەکانم هاتنە خوارەوە، بۆ دڵپاکی و میهرەبانی ئەو گریام، بۆ ئەوە گریام خێری لەخۆی نەبینی و لەتافی لاویدا بارگە و بنەی بۆ گۆڕ پێچایەوە و منداڵەکانی هەتیو خست، خۆ منداڵەکانی بەو هیواوە دەژیان کە ڕۆژێك باوکیان ئازاد دەکرێت و پێی شاد دەبنەوە.

دەمودەست پۆلیسەکان و ئەفسەری ئیشکگر هاتنە شوێنی ڕووداوەکە، دواتر تەرمەکەیان خستە سەر بەتانیەکەی خۆی و بردیان، ئەو شەوە تا بەیانی کەسمان نەخەوتین، هەمووومان بە کۆڵێك خەم و پەژارەوە دانیشتین، وەك بڵێی ئیشکگری ڕۆحی

ئەو بووبین، لەخۆمم دەپرسی : چۆن وەڵامی ئەو پرسیارەم دەستبکەوێ ئایا ئەبوو مریەم دەچێتە بەهەشت یان دۆزەخ؟ ئەو دوو تاوانی خستبوە سەر شانی خۆی، یەکەمیان بە پێچەوانەی ڕازی بوونی خوای گەورە وەك من بەشێك بوو لەو تاوانانەی ئەنجام درابوو، دووەمیان خۆی کوشت.

تا چەند ڕۆژێك پێش ئێستا بەباشی نانمان بۆ نەدەخورا، هەمووومان لەپرسەی ئەودا بووین، واماندەزانی دنیامان بەسەردا ڕووخاوە.

مامۆستا هیوا ناوی ئەبوو مریەمی لە دەفتەرەکەی تۆمار کرد، لە لاپەڕە تەرخانکراوەکەی ئەودا بە خەتێکی گەورە نووسی: خۆ کوشتن بۆ ئینسان تەنها کوشتنی خود نیە، بەڵکو کوشتنی ژنیشە، کوشتنی منداڵیشە، تاوانێکە تەنها دەرهەق بە خود ناکرێ، بەڵکو دەرهەق بە تاك بەتاکی مرۆڤایەتی دەکرێ.

دەفتەرەکەی پڕ کردبوو لەناوی ئەوانەی خۆیان کوشتبوو، لەبەرخۆیەوە گوتی:

-ئیدی دەبێت بیر لە ژیانی ئەوانە بکەینەوە کە هێشتا خۆیان نەکوشتوە و پێیان بڵێین: ڕێگەی تر زۆرە بۆ خۆ دەرباز کردن لە تەونی کێشەکانتان، ئیدی نابێ کەس خۆی بکوژێت.

ئیدی دەبێت بە پەلە ئەوانە بدۆزینەوە کە گرفتارن و خەریکە دەرد و کێشەکانیان بەرەو مردن پەلکێشیان دەکات، فریایان بکەوین و تام و چێژ و جوانیەکانی ژیانیان پێنیشان بدەین.

## (٧)

چەند کاتژمێرێک بەر لەئێستا، مامۆستا هیوا کە یاسینی چایچی برام بە ئەفەندی ناوی دەبرد، بەندیخانەی جێهێشت و ماڵئاوایی لێکردم، هەردوولا ڕوومەتی ماچ کردم و پێی گوتم: مرۆڤی ئیماندار ئەوانەن خواپەرستی کوێریان ناکات لەبینینی ڕاستیەکانی ژیانیان و پەیوەندیەکی بەتینیان لەگەڵ خودا و بەرژەوەندییە گشتییەکان هەیە، دەبێ بۆ ئەوە خودا بپەرستین تا ببین بە چاکەکار و سودمان بۆ دەوروبەر ڕەنگ بداتەوە، بەهۆی باشی ڕفتار و هەڵسوکەوتی ئێمەوە خەڵک حەز بکات خوا بپەرستێت و ئەرکە ئاینیەکان جێبەجێ بکات، نەك خەڵك بەهۆی هەڵسوکەوتی ئێمەوە خودا لەبیر بکات و ئیمان بەپێویست نەزانێ، بەلایەنی کەم ئێمە نەبینە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵك لەخودا و ڕوو بکاتە خراپەکاری.

مامۆستا هیوا ئازایەتی و خۆڕاگری پێبەخشیم، فێری کردم خۆم لە هەڵە کردن بپارێزم، گەر هەڵەشم کرد، پەشیمان ببمەوە و سوود لە هەنگاوە خوارەکانم وەرگرم و دووبارەیان نەکەمەوە، دواین جار پرسیارێکی گرنگی لێکردم: گەر ئێستا ئازاد بکرێی، یەکەم کارت چی دەبێت؟

گوتم: گەر بڵندگۆیەك هەبێ و لێوەی هەموو خەڵکی کوردستان گوێیان لێبێ، لەوێوە داوای بووردن لە هەموو خەڵکی کوردستان و دایك و باوك و سارای خێزانم و هەردوو جگەرگۆشەکەم و

کاکم یاسین و جەنابت دەکەم، پێتان دەڵێم لەئێستا بەدواوە بۆ ئەوە خوا دەپەرستم ببم بە چاکەکار.

ئەو چەند کاتژمێرێکی تر لە فرۆکەخانەوە بەرەو فەرەنسا دەگەڕێتەوە، هەگبەکەی پڕە لە هەڵە و پەڵە و بیرکردنەوی کوێرانەی دەیان کەس کە بڕیاری هەڵەی خۆیان سەرگەردانی کردوون، یەك لەوانە منم.

بە ڕۆیشتنی، فرمێسك لە هەردوو چاوم هاتە خوارەوە، من لەگەڵی ڕاهاتبووم، پێمخۆش بوو هەمیشە لێرە بێت، تا ڕێی ڕاستم پێنیشان بدات و ئامۆژگاریم بکات، چوونکە بەوە دڵخۆش بووم و ئەرکی سەرشانی سووك دەکردم.

ئێستا لە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەدام کە کارمەندێکی بەندیخانە ناوم دەخوێنێتەوە و پێمدەڵێت : ئیتر لەم چرکەیەوە تۆ ئازادی.

......... کۆتایی .........

## ناساندنێکی کورت



ناوی تەواو: جمعە محەمەد نەجم (جمعە کانی لەلەیـی)

لەدایکبوی : پایزی ۱۹۷۳

بڕوانامەی دبلۆم لە کارگێڕی یاسا

پیشە : ئەفسەری پۆلیس

بەرهەمە چاپکراوەکانی:

-کەرکووك لەبەردەم شاڵاوی بە عەرەب کردن دا ۲۰۰۲ ، لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون.

-مەملەکەتی دڕکاوی ۲۰۱۵ ، ڕۆمان.

-ڕەش و سپی ۲۰۱۹ ، ڕۆمان .

-کورەی شۆڕش کێی سوتاند؟ ۲۰۲۱ ، لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون.

-گرێکوێرە ۲۰۲۳ ، ڕۆمان.

-بەرهەمێکی تری ئامادەیە بۆ چاپ بەناوی دزەکانی شار، ڕۆمان.



**مرۆڤی ئیماندار ئەوانەن خواپەرستی**
**کوێریان ناکات لە بینینی راستییەکانی ژیان،**
**دەبێ بۆ ئەوە خوا بپەرستین کە ببین بە چاکەکار**